بسم الله الرحمن الرحيم

نارین

# چەند ڕاستیەکی زانستی لە قورئانی پیرۆز

## چەند نموونەیەك لە ئاماژەکانی قورئان بۆ زەویناسی

| | |
|---|---|
| نــــاوی کتێـــــــــب: | چەند ڕاستیەکی زانستی لە قورئانی پیرۆز |
| نووسیـــنـــــــــی: | دکتۆر زغلول راغب النجار |
| وەرگێـــڕانـــــــی: | محمد علی |
| پێداچوونـــــــەوەی: | م/ عبدالرحمن العصافی |
| نـەخشەسازی ناوەوە: | کۆمپیوتەری نارین (محمد علی) |
| نۆرەو ســـالّی چاپ: | چاپی دووەم ٢٠١٢ ز |
| شــوێـنی چـــاپ: | بەیروت ـ لوبنان |
| ژمــــارەی سپـارد‌ن: | (٤٣١)ی ساڵی (٢٠٠٧)ی بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکانی پێدراوە. |

بازاڕی زانست بۆ کتێب و چاپەمەنی

website: www.nareenpub.com
E-mail: info@nareenpub.com
تەلەفۆن: ٢٥١١٩٨٢ ٦٦ (٠٠٩٦٤)
مۆبایل: ٠٠٩٦٤ ٧٥٠٤٠٦٤٦١٠



دار المعرفة
اشراف و تنفيذ طباعي دار المعرفة بيروت - لبنان
WWW.MAREFAH.COM

# چەند ڕاستیەکی زانستی لە قورئانی پیرۆز

## چەند نموونەیەك لە
## ئاماژەکانی قورئان بۆ زەویناسی


**نوسینی**

دکتۆر زغلول راغب النجار

**وەرگێڕانی**

محمد علی أحمد



ناریــن

# چەند ڕاستیەکی زانستی لە قورئانی پیرۆز

## چەند نموونەیەك لە ئاماژەکانی قورئان بۆ زەویناسی




نوسینی

دکتۆر زغلول راغب النجار

وەرگێڕانی

محمد علي أحمد

# چەند ڕاستیەکی زانستی لە قورئانی پیرۆز

## چەند نموونەیەك لە ئاماژەکانی قورئان بۆ زەویناسی




**نوسینی**

دکتۆر زغلول راغب النجار

**وەرگێڕانی**

محمد علي أحمد

# پێشەكی وەرگێڕ

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله رب العالمين والصلاة والسلام على سيدنا محمد وعلى اله وصحبه وسلم اما بعد.

زۆر سوپاسی خوای گەورە دەكەم كە یارمەتی دام بۆ وەرگێڕانی ئەم پەرتووكە، بە ڕاستی پەرتووكێكی لەم شێوەیە، سەرەتایەكەو زۆر گرینگیشە بۆ ڕۆژگاری ئەمڕۆمان، هەروەها بۆ وەڵامدانەوەی ئەو كەسانەی دژایەتی قورئانی پیرۆز دەكەن‌و دەڵێن كۆنەو دەست نادات بۆ ئەم سەردەمە، چونكە ئەم سەردەمە سەردەمی پێشكەوتنەو پێویست دەكات مرۆڤ لەگەڵ ئەم پێشكەوتنەدا یاسای نوێ بۆ خۆی دابنێت‌و كار بە قورئانی پیرۆز نەكات. وەڵامی ئەم قسانە لەم پەرتووكەدا بە جوانی ڕوون كراوەتەوە، كە ئەمەش پوختەیەكە بۆ ڕەواندنەوەی گومان‌و زۆریش بەسوودە بۆ كەسانێك كە دەیانەوێت ڕاستی ببیستن، ئەمەش بە هۆی ئەوەی ئەم پەرتووكە باس لە چەند ئیعجازێكی زانستی قورئانی پیرۆز دەكات كە زانستی مرۆڤایەتی ماوەیەكی زۆر نیە پێی گەیشتووە، بەلاَم قورئانی پیرۆز زیاتر لە (١٤٢٨)

ساڵ لەمەوبەر ئامـاژەی پێکـردووە، ئەمـەش بەڵگەیـە لەسـەر ئەوەی کە قورئانی پیرۆز وتەی پەروەردگاری مەزنە.

قورئان دەریایەکی پڕ لە زانیاریە کە تەواوبوونی بۆ نییەو کەس ناتوانێت هەمووی بزانێت، چونکە ڕۆژ بە ڕۆژ لەگەڵ پێشکەوتنی سەردەمدا مرۆڤ زانیاری زیاتری لێ فێر دەبێت کە کەسانی پێش ئێمە ئەم شتانەیان نەزانیوە، بۆیە پێویستە هەموو تاکێکی کورد سوود لەم زانیارییانە وەربگرێت، هەموو موسوڵمانانیش زیاتر هەوڵبدەن دەست بە قورئانی پیرۆزەوە بگرن، وەك چۆن وڵاتانی کوفر هەوڵی بێ وچان بۆ بڵاوکردنەوەی ئایینی خۆیان دەدەن ئێمەش ئەوهاو زیاتریش بتوانین هەوڵی بڵاوکردنەوەی ئایینی پیرۆزی ئیسلام بدەین نەك سەرسام ببین بەشتێك کە هیچ سوودی بۆمان نییە.

گومانی تێدا نییە کە زانستو زانیاری وەرگرتن فەرزە لەسەر هەموو موسوڵمانێك بۆیە داوا لە هەموو تاکێکی کورد دەکەم کە هەوڵی وەدەستخستنی زانستو زانیاری بدەن لە هەموو لایەنەکانی ژیانیان.

زۆر سوپاسی ئەو مامۆستایانە دەكەم كە یارمەتییان داوم لە وەرگێڕانی ئەم پەرتووكە، وە سوپاسیش بۆ ئەو هاوڕێیانەی كە یارمەتیدەرم بوون لە ئەنجامدانی ئەم كارەمدا.

لە كۆتاییدا هیوادارم بە وەرگێڕانی ئەم پەرتووكە بۆشاییەكم لە زانستو زانیاری پڕكردبێتەوەو توانیبێتم مافی تەواوی ئەم پەرتووكە بدەم.

محمد علی أحمد

٣\ربیع الثاني\١٤٢٨كۆچی، ٢٠\٤\٢٠٠٧زاینی

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

# پێشەکی

پێناسەی (المعجزة) دەکەین کە کۆیەکەی بریتیە لە (المعجزات) بەوەی کارێکی لە ئاسابەدەرە (واتا لە دەرەوەی دەسەڵاتی مرۆڤدایە)و بەرهەڵستی ناکرێتو لە توانای مرۆڤدا نییە هێنانەوەی نموونەیەك وەك ئەو موعجیزەیە.

(اعجاز)ی قورئانی پیرۆز واتا بێ توانایی‌و لاوازیی هەموو دروستکراوەکان –مرۆڤ و جنۆکەکان– بەوەی شتێك بهێننەوە وەك ئەو موعجیزەیە، هەر بۆیە پەروەردگاری بەرزو پیرۆزمان لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرمووێت:

﴿ قُل لَّئِنِ ٱجْتَمَعَتِ ٱلْإِنسُ وَٱلْجِنُّ عَلَىٰٓ أَن يَأْتُوا۟ بِمِثْلِ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ لَا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِۦ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا ﴿٨٨﴾ ﴾ (الاسراء: ٨٨).

واتا: ئەی محمد (ﷺ) پێیان بڵێ: سوێند بە خوا ئەگەر هەموو ئادەمیزادو جنۆکەکان کۆببنەوە لەسەر ئەوەی قورئانێکی وەك ئەمە دانێن‌و بهێننەوە ناتوانن کاری وابکەن‌و ناتوانن لە وێنەی ئەو

بهێنن، ئەگەرچی هەموو لایەکیان ببنە پشتگیرو یارمەتیدەری یەکتر.

لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت:

﴿وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ وَادْعُوا شُهَدَاءَكُم مِّن دُونِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿٢٣﴾ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُوا وَلَن تَفْعَلُوا فَاتَّقُوا النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ ﴿٢٤﴾﴾ (البقرة: ٢٣ـ٢٤).

واتا: جا ئەگەر ئێوە لە دوو دڵیدان و گومانتان لەم قورئانە پیرۆزە هەیە کە دامانبەزاندووە بۆ بەندەی خۆمان محەمەد (ﷺ) ئەگەر بۆتان دەکرێت ئێوەش هەوڵبدەن سورەتێکی وەك ئەو بهێننەوە، هاوپەیمان و هاوکارەکانیشتان جگە لە خوا بۆ ئەو مەبەستە بانگ بکەن ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن، خۆ ئەگەر نەتانتوانی و هەرگیز ناشتوانن (کەواتە باوەڕبهێنن) و خۆتان بپارێزن لەو ئاگرەی سوتەمەنییەکەی خەڵکی و بەردە، کە بۆ بێباوەڕو خوانەناسان ئامادەکراوە.

هەروەها دەفەرمووێت:

﴿وَمَا كَانَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ أَن يُفْتَرَىٰ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَٰكِن تَصْدِيقَ ٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ ٱلْكِتَٰبِ لَا رَيْبَ فِيهِ مِن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٣٧﴾ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ قُلْ فَأْتُوا۟ بِسُورَةٍ مِّثْلِهِۦ وَٱدْعُوا۟ مَنِ ٱسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٣٨﴾﴾ (یونس: ٣٧ـ٣٨).

واتا: وەنەبێت ئەم قورئانە لە لایەن کەسێکەوە داڕێژرابێتو هەڵبەسترابێت جگە لە خوا، بەڵکو ڕاستیو ڕەوانی کتێبە ئاسمانیەکانی پێش خۆیشی دووپات دەکاتەوە، هەروەها ڕوونکەرەوەی بیروباوەڕو ئەرکەکانە، بەڕاستی هیچ گومان لەوەدا نییە کە ئەم قورئانە لە لایەن پەروەردگاری هەموو جیهانەوە ڕەوانە کراوە* یان دەڵێن کە محەمەد (ﷺ) قورئانی هەڵبەستووە، بڵێ: دە ئێوەش سوڕەتێك وەك سوڕەتەکانی داڕێژنو بیهێنن، داوا بکەن لە هەر کەسێکی تر کە دەتوانن جگە لە خوا (کە یارمەتیتان بدات) درێغی مەکەن ئەگەر ڕاستگۆن.

هەروەها خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ قُلْ فَأْتُوا۟ بِعَشْرِ سُوَرٍ مِّثْلِهِۦ مُفْتَرَيَٰتٍ وَٱدْعُوا۟ مَنِ ٱسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٣﴾﴾ (هود: ١٣).

واتا: یان دەڵێن كە محەمەد (ﷺ) قورئانی هەڵبەستووە، پێیان بڵێ: جا ئێوەش دە سورەتی هەڵبەستراو وێنەی ئەم قورئانە بهێنن، هەر كەسیش لە خوای گەورە بەدەر، دەتوانن بانگ بكەن (بۆ هاوكاریتان پەنای بۆ بەرن) ئەگەر ڕاست دەكەن.

خوای گەورە جەخت دەكاتەوە لەسەر تەواویی قورئانی پیرۆزو دەفەرمووێت:

﴿أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ ۚ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُوا۟ فِيهِ ٱخْتِلَـٰفًا كَثِيرًا ﴿٨٢﴾﴾ (النساء: ٨٢).

واتا: ئەوە بۆ ئەوانە سەرنجی قورئان نادەنو لێكی نادەنەوەو لێی ورد نابنەوە؟ خۆ ئەگەر لە لایەن كەسێكی ترەوە بوایە جگە لە خوا بێگومان جیاوازیو دژایەتییەكی زۆریان تێدا دەدۆزیەوە.

وە دەفەرمووێت:

﴿إِنَّهُۥ لَقُرْءَانٌ كَرِيمٌ ﴿٧٧﴾ فِى كِتَـٰبٍ مَّكْنُونٍ ﴿٧٨﴾ لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلْمُطَهَّرُونَ ﴿٧٩﴾ تَنزِيلٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٨٠﴾﴾ (الواقعة: ٧٧ـ٨٠).

واتا: بەڕاستی ئەوە قورئانێكە زۆر پیرۆزو بەڕێزە، لە كتێبێكی شاراوەدا كە (لوح المحفوظ)ە پارێزراوە، (هەروەها نوسخەكانی سەر زەویشی پارێزراوەو پارێزراو دەبێت هەتا دنیا دنیایە)، تەنها

پاکان نەبێت کەس دەستی لێ نادات، ئەم قورئانە لەلایەن پەروەردگاری جیهانیانەوە نێردراوەتە خوارەوە.

وە دەفەرمووێت:

﴿بَلۡ هُوَ قُرۡءَانٞ مَّجِيدٞ ٢١ فِي لَوۡحٖ مَّحۡفُوظِۭ ٢٢﴾ (سورەتی البروج:٢١و٢٢)

واتا: بەڵکو ئەوە قورئانێکی بەرزو بڵندو پایەدارە* کە لە لاپەڕەی تایبەتیو لەسەر تابلۆی پیرۆز، پارێزراوە لە (لوح المحفوظ)دا.

وە دەفەرمووێت:

﴿ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ ٢﴾ (سورەتی البقرة: ٢).

واتا: ئەو قورئانە کتێبێکە هیچ گومانێکی تێدا نییە، کە مایەی ڕێنموییو سەرچاوەی هیدایەتە بۆ خواناسانو پارێزگاران.

وە دەفەرمووێت:

﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ لِتَحۡكُمَ بَيۡنَ ٱلنَّاسِ بِمَآ أَرَىٰكَ ٱللَّهُۚ وَلَا تَكُن لِّلۡخَآئِنِينَ خَصِيمٗا ١٠٥﴾ (سورەتی النساء: ١٠٥).

واتا: ئێمە بەڕاستی قورئانمان بۆ لای تۆ دابەزاندووەتە خوارەوە، سەرتاپای حەقو ڕاستی بەردەوامە، بۆ ئەوەی دادوەری

بكـەیت لـە نێـوان خەڵكیـدا بـەو شـێوەیەی خـوا نیـشانی داویـتو ڕێنموونی كردوویتو نەكەیت بەرگری لە ناپاكان بكەیت.

قورئـــانی پـــیرۆز پـــەڕاوێكی دەرئاســـایە لـــە ڕوونكردنـــەوەو ڕێكخـستنەكەیو شـێوازی ڕەوانبێژییەكـەیو لـە تـەواویی پـەیامو ناوەڕۆكەكەی، بۆ هـەموو خـەڵكی دابـەزیوە بـەو ئایینـە ئیـسلامەی پـەروەردگاری بـەرزو پیرۆزمـان فێـری باوكمـان ئـادەمی (سـەلامی خوای لیّ بێـت) كـرد لـە كـاتی دروسـتكردنو بـەدیهێنانی، دووبـارە دابیەزاندووەتـەوە بـۆ پێغەمبـەرانو ڕەوانـەكراوانیو لـەم پەیامـە كۆتاییـە كـە دابـەزێنراوە بـۆ سـەر پێغەمبـەرمان (علـیهم الـصلاة والـسلام) تـەواوی كـردووەو پاراسـتوویەتی، سـەرەڕای ئەمـەش قورئانی پیرۆز موعجیزەو دەرئاسایە لـە هـەموو ئـەو بیروباوەڕانـەی بانگهێشتی خەڵكی دەكەن بۆ پەیوەست بـوون پێیـەوەو لـە هـەموو ئەو پەرستـشانەی كـە بانگهێـشتی خـەڵكی دەكـات بـۆ لێكۆڵینـەوە لەسەریو دەرئاسایە لە دەستووره خورەوشـتە بـیّ هاوتاكـەیو لـە هەموو یاسا دانانێك لـە یاسـایە پڕشـنگدارە وردەكـەیو یەكسانیو گشتگیریو ڕوونكردنەوەكانی..... ! !

هـەروەها قورئـانی پـیرۆز دەرئاسـایە لـە نیـشاندانی مێـژوویی ژمارەیەك لە نەتەوەكانی ڕابـردوو، چـۆنیەتی هەڵسوكەوتی لەگـەڵ

پێغەمبەرانی خواو لە شێوازی پاداشتدانەوەو سزادان، دەرئاسایە لە شێوازە پەروەردەییەکەی‌و وتارە دەروونیەکەی‌و لە هەواڵدانی بە شتی پەنهان (غیب)، هەروەها ئاماژەدانی زۆری بۆ گەردوون‌و پێکهاتەو دیاردەکانی، ئەمە لایەنی کۆتاییە لە لایەنەکانی ئیعجاز لە پەڕاوی خوادا کە مەبەست پێی (ئیعجازی زانستی قورئانی پیرۆزە)و مەبەست پێی پێشەنگیی قورئانی پیرۆزە بە ئاماژەدانی بە ژمارەیەك لە ڕاستییەکانی گەردوون‌و دیاردەکانی، کەوا زانستی وەدەستکەوتوو نەیتوانیوە لێی تێبگات تەنها دوای چەند سەدەیەکی دووردرێژ لە هاتنەخوارەوەی قورئانی پیرۆز نەبێت کە لە دە سەدەی تەواو زیاترە بە لایەنی کەمەوە، کە ناگونجێت کەسێکی هۆشمەند وا لێك بداتەوە ئەم ڕاستیە زانستییانە سەرچاوەیەکی تری هەبێت جگە لە خوای بەدیهێنەری پاك‌و بێگەرد، لە جێگیرکردنی ئەوەی کە بە دڵنیاییەوە قورئانی پیرۆز وتەی خوای بەدیهێنەرەو بەڕاست دانانی پێغەمبەرو کۆتا نێردراو محەمەد (ﷺ) لە پێغەمبەرایەتی‌و پەیامەکەی‌و لە ڕاگەیاندن‌و بانگەواز بۆ ڕێگای پەروەردگاری.

ئیعجازی زانستی لە قورئانی پیرۆز شێوازێکە لە بانگەواز بۆ ئایینی خوا بە زمانێکی گونجاو بۆ سەردەمی شانازیکردن بە

زانیاری زانستیو پەرەسەندنی هۆكارە تەكنیكییەكانی ژیانمان، قورئان هەر زوو ئاماژەی بەمە كردووەو دەفەرمووێت:

﴿فَلَمَّا نَسُوا مَا ذُكِّرُوا بِهِ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَابَ كُلِّ شَيْءٍ حَتَّىٰ إِذَا فَرِحُوا بِمَا أُوتُوا أَخَذْنَاهُم بَغْتَةً فَإِذَا هُم مُّبْلِسُونَ ﴿٤٤﴾﴾ (سورەتی الانعام: ٤٤).

واتا: ئینجا كاتێك ئەو بەرنامەو ڕێبازەی كە یادیان خرابووەوە فەرامۆشیان كرد، ئێمەش دەروازەكانی هەموو شتێكمان بۆ والاكردنەوە هەتا كاتێك دڵخۆش و شادمان بوون بەوەی پێیان درا، ئیتر لە ناكاو گرتمانو هەموویانمان سەرگەردانو ڕیسوا كرد، ئینجا ئەوان بێ ئومێد بوونو بە غەمو پەژارەیەكی زۆرەوە تیاچوون.

هەروەها دەفەرمووێت:

﴿وَالَّذِينَ سَعَوْ فِي آيَاتِنَا مُعَاجِزِينَ أُولَٰئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مِّن رِّجْزٍ أَلِيمٌ ﴿٥﴾ وَيَرَى الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ الَّذِي أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ هُوَ الْحَقَّ وَيَهْدِي إِلَىٰ صِرَاطِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ ﴿٦﴾﴾ (سورەتی سبأ: ٥ـ٦).

واتا: ئەوانەی هەوڵو كۆششیان داوە تا بەربەست دروست بكەن لە ڕێگەی پەیامی ئێمەدا، وا دەزانن لە سزای ئێمە ڕزگاریان دەبێ، ئەوانە سزاو تۆڵەیەكی زۆر بە سۆو پڕئازاریان بۆ ئامادەیە*

ئەوانەی زانستو زانیاریان پیّ دراوە (چ زانستی ئایینی، وەك گاورو جوولەکە، یان ئەوانەی لە زانستە ماددیەکاندا ڕۆدەچن) چاك دەزانن ئەوەی لە لایەن پەروەردگارتەوە بۆت ڕەوانەکراوە هەر ئەوە حەقو ڕاستە، هیدایەتو ڕێنموونی بەخشە بۆ ڕێبازی پەروەردگاری خاوەن دەسەلاتو شایستەی سوپاسو ستایش.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموویّت:

﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ۗ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿٥٣﴾ ﴾ (سورەتی فصلت: ٥٣).

واتا: ئێمە لە ئایندەدا بەلگەو نیشانەی سەرسوڕهێنەریان نیشان دەدەین لە ئاسۆکانی بوونەوەرداو لە خودی خۆیشیاندا (بێگومان ئاشکرایە لە سەردەمی زانستیدا چەندە نهێنیەکانی بوونەوەر ئاشکرا بووە، زاناکان بە گشتیو زاناکانی ئەستێرەناسی سەرگەردانن لە وردەکاریو دامەزراوییو گەورەییو فراوانی ئەم گەردوونە، هەروەها لە ئالۆزی جەستەییو عەقلییو دەروونیی ئادەمیزاد)، ئەمەش بۆ ئەوەی تا چاك بۆیان ڕوون بێتو دلنیابن ئەو زاتە حەقو ڕاستو ڕەوایە، ئایا شایەتی پەروەردگارت بەس نییە کە بێگومان ئاگاو زانایە بە هەموو شتێك؟

لە ئایەتێكی تردا دەفەرموویێت:

﴿لَّٰكِنِ ٱللَّهُ يَشْهَدُ بِمَآ أَنزَلَ إِلَيْكَ أَنزَلَهُۥ بِعِلْمِهِۦ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَشْهَدُونَ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا ﴿١٦٦﴾﴾ (سورەتی النساء: ١٦٦).

واتا: ئەی محەمەد (ﷺ) هەرچەندە ئەو خەڵكە باوەڕت پێ ناكەن، بەڵام خوا خۆی شایەتە لەسەر ئەو قورئانەی ڕەوانەی كردووە بۆت، بەئاگاداریو زانیاری خۆیشی ڕەوانەی كردووە، فریشتەكانیش شایەتی دەدەن (لەسەر ئەوە، هەرچەندە) خوا خۆی بەسە بۆ ئەو شایەتییە.

هەروەها دەفەرموویێت:

﴿قُلْ أَىُّ شَىْءٍ أَكْبَرُ شَهَٰدَةً قُلِ ٱللَّهُ شَهِيدٌۢ بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ وَأُوحِىَ إِلَىَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ لِأُنذِرَكُم بِهِۦ وَمَنۢ بَلَغَ أَئِنَّكُمْ لَتَشْهَدُونَ أَنَّ مَعَ ٱللَّهِ ءَالِهَةً أُخْرَىٰ قُل لَّآ أَشْهَدُ قُلْ إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ وَإِنَّنِى بَرِىٓءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ ﴿١٩﴾﴾ (سورەتی الانعام: ١٩).

واتا: (ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بەوانە بڵێ كە شایەتیان دەوێت لەسەر پێغەمبەرایەتی تۆ) چ شتێك گەورەترو ڕاسترە لە شایەتیدا؟! هەر خۆت بڵێ: (الله) ڕاسترین شایەتە، كە شایەتی نێوان منو ئێوەیە، من ئەم قورئانەشم بە وەحیو نیگا بۆ هاتووە تا ئێوەو هەموو ئەوانەی پێیان گەیشتووە ئاگادارو بێدار بكەمەوە،

(لەگەڵ ئەم هەموو ڕوونکردنەوانەدا) ئایا ئێوە ئیتر شایەتی دەدەن کە بەڕاستی لەگەڵ خوادا چەند خوایەکی تر هەبێت؟! بڵێ: (من بەش بەحاڵی خۆم) شایەتی ناحەق و ناڕەوای وا نادەم و بڵێ: بە ڕاستی ئەو خوایە زاتێکی تاك و تەنهایە و من بە ڕاستی بێ تاوانم لە هەموو ئەو شتانەی ئێوە دەیانکەنە هاوەڵ و هاوتای ئەو زاتە).

هەروەها دەفەرمووێت:

﴿وَكَذَّبَ بِهِۦ قَوْمُكَ وَهُوَ ٱلْحَقُّ ۚ قُل لَّسْتُ عَلَيْكُم بِوَكِيلٍ ﴿٦٦﴾ لِّكُلِّ نَبَإٍ مُّسْتَقَرٌّ ۚ وَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٦٧﴾﴾ (سورەتی الانعام: ٦٦ـ٦٧).

واتا: (لەگەڵ ئەوەشدا) قەومەکەی تۆ ئەم بەرنامەو قورئانەیان بەدرۆزانی لە کاتێکدا هەر ئەوەیە حەقیقەت و ڕاستی، پێیان بڵێ: ئەوە ئیتر من دەسەڵاتی ڕزگارکردنی ئێوەم نییەو من پشتیوانی ئێوە نیم (ئەگەر خوا بەڵایەکتان بەسەردا بهێنێت)* بۆ هەموو هەواڵێك (کە لە قورئاندا هاتووە) کات و شوێنی بەدیهاتنی خۆی هەیە، لە ئایندەشدا دەیزانن.

هەروەها دەفەرمووێت:

﴿أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ۖ قُلْ فَأْتُوا۟ بِعَشْرِ سُوَرٍ مِّثْلِهِۦ مُفْتَرَيَٰتٍ وَٱدْعُوا۟ مَنِ ٱسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٣﴾ فَإِلَّمْ يَسْتَجِيبُوا۟ لَكُمْ فَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَآ

أُنزِلَ بِعِلْمِ ٱللَّهِ وَأَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَهَلْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٤﴾ (سورەتی هود: ١٣_١٤).

واتا: بەڵكو (لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگانەدا) ئەوانە دەڵێن محەمەد قورئانی هەڵبەستووە، پێیان بڵێ: جا ئێوەش دە سورەتی هەڵبەستراو وێنەی ئەم قورئانە بهێنن، هەر كەسیش لە خوای گەورە بەدەر، دەتوانن، بانگ بكەن (بۆ هاوكاریتان پەنای بۆ بەرن) ئەگەر ڕاست دەكەن* جا ئەگەر (خوانەناسان) نەهاتن بەدەم ئەم داوایەتانەوە، ئەوە ئیتر چاك بزانن و دڵنیا بن كە بەڕاستی ئەم قورئانە هەر بە ئاگاداری خوای گەورە دابەزێنراوەو بشزانن جگە لەویش خوایەكی تر نییە، ئایا ئیتر ئێوە (ئەی بێ باوەڕان) ملكەچ دەبن؟

هەروەها دەفەرمووێت:

﴿ قُلْ أَنزَلَهُ ٱلَّذِى يَعْلَمُ ٱلسِّرَّ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٦﴾ ﴾ (سورەتی الفرقان: ٦).

واتا: تۆ ئەی محەمەد (ﷺ) بڵێ: ئەو زاتەی ئەم قورئانەی دابەزاندووە بە هەموو نهێنیەك دەزانێت لە ئاسمانەكان و زەویدا، هەر ئەویش هەمیشەو بەردەوام لێخۆشبوو و میهرەبانە.

هەروەها دەفەرموویت:

﴿وَقُلِ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ سَيُرِيكُمۡ ءَايَٰتِهِۦ فَتَعۡرِفُونَهَاۚ وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ ﴿٩٣﴾﴾ (سورەتی النمل: ٩٣).

واتا: بڵێ: سوپاس و ستایش بۆ خوا، لە ئایندەیەکی نزیکدا هەموو بەڵگەو نیشانەکانی خۆیتان نیشان دەداتو دەیانناسنەوە (کە هەمووی دەستکارو بەدیهێنراوی خوایە)، بێگومان پەروەردگاری تۆ غافڵو بێ ئاگا نییە لەو کاروکردەوانەی ئەنجامی دەدەن.

هەروەها دەفەرموویت:

﴿إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴿٨٧﴾ وَلَتَعۡلَمُنَّ نَبَأَهُۥ بَعۡدَ حِينِۢ ﴿٨٨﴾﴾ (سورەتی ص: ٨٧ـ٨٨).

واتا: ئەم قورئانە تەنها ئامۆژگاریە بۆ هەموو خەڵکی جیهان لە هەموو کاتو شوێنێکدا* بەڕاستی لە داهاتوویەکی نزیکدا، هەر لە دنیادا هەواڵی ڕاستیو دروستی ئەم ئایینە دەزانن، لە ڕۆژی دواییشدا هەموو شتێك بە تەواوی ئاشکراو ڕوون دەبێت.

هەروەها لەم ئایەتەشدا دەفەرموویت:

﴿وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦ خَلۡقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَثَّ فِيهِمَا مِن دَآبَّةٖۚ وَهُوَ عَلَىٰ جَمۡعِهِمۡ إِذَا يَشَآءُ قَدِيرٞ ﴿٢٩﴾﴾ (سورەتی الشوری: ٢٩).

واتـا: لـە نیـشانەو بەڵگـەكانی گـەورەییو دەسـەڵاتی خـوا: دروستكردنی ئاسمانەكانو زەویو ئـەو زیندەوەرانەیـە كـە تیایانـدا بڵاوی كردۆتەوە، هـەر ئـەو زاتـە كاتێـك بیـەوێت توانـاو دەسـەڵاتی بەسەر كۆكردنەوەیاندا هەیە.

# هەندێك پێویستی بۆ ڕەفتارکردن لەگەڵ بابەتی ئیعجازی زانستی لە قورئانی پیرۆزدا:

لەم نواندنانەی پێشوودا بە ڕوونی بۆمان دەردەکەوێت سەلماندنی ئیعجازی زانستی لە قورئانی پیرۆز لەم سەردەمی پێشکەوتنی زانستیو تەکنیکییەی تێیدا دەژین، بریتییە لە هەڵوێستێکی لەڕووداوەستان (تەحەداکردن) بۆ هەموو خەڵکی – موسوڵمانو نا موسوڵمان– بەوەی پەڕاوێك پێش هەزارو چوار سەد ساڵ زیاتر لەمەوپێش دابەزیوە، بۆ سەر پێغەمبەرێکی نەخوێندەوار (ﷺ)و لە نەتەوەیەك زۆربەی زۆریان نەخوێندەوار بوون، سەرەڕای ئەوەش ئەم پەڕاوە ڕاستی زانستی گەردوونی وای تێدایە مرۆڤ پێی نەگەیشتووە مەگەر دوای هەوڵدانێکی زۆرو دوورودرێژی دەیان هەزار لە زانایان بە درێژایی مێژووی مرۆڤایەتی بەتایبەتی لە چەند ساڵێك لە کۆتاییەکانی سەدەی بیستەم چڕبووەوە.

کەسی بەرەنگاریکار پێویستەو دەبێت لەسەر زەمینەیەکی جێگیر ڕاوەستابێت، سەرەڕای ئەوەش ناگونجێت هیچ شتێك لەم بوارەدا دابنرێت جگە لە ڕاستیە بنبڕو جێگیرەکان نەبێت هەتا

تەحەددایەکە بە ئاستی خۆی دەگات لە بواری جێگیربوونی ئیعجازی زانستی لە قورئانی پیرۆزدا.

ئەم پەیوەست بوونە ئەرکێکی پێویستە لە نیشاندانی ئایەتە گەردوونییەکان لە قورئانی پیرۆزدا جگە لە ئایەتەکانی بەدیهێنان بەهەرسێ ڕەهەندەکەیەوە:

[١] بەدیهێنانی گەردوون.

[٢] بەدیهێنانی ژیان.

[٣] بەدیهێنانی مرۆڤ.

ئەوەش بەهۆی ئەوەی کرداری بەدیهێنان کردارێکی پەنهانەو هیچ کەسێك لە جنۆکەو مرۆڤ نەیانبینیووە، لەبەر ئەوە مرۆڤ ڕاستەوخۆ هەستی پێناکات، لەمەوە خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿مَّآ أَشۡهَدتُّهُمۡ خَلۡقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلَا خَلۡقَ أَنفُسِهِمۡ وَمَا كُنتُ مُتَّخِذَ ٱلۡمُضِلِّينَ عَضُدٗا ٥١﴾ (سورەتی الكهف: ٥١).

واتا: وەنەبێت من لە کاتی دروستکردنی ئاسمانەکانو زەویدا ئەوانم ئامادەکردبێت، بگرە هەتا لە دروستبوونی خۆشیان ئاگادارنین، بەڕاستی من هەرگیز ئەوانەی خەڵك گومڕا دەکەن نەمکردوون بە یارمەتیدەری خۆمو پشتم پێ نەبەستوون.

بەلآم ئەو قورئانە پیرۆزەی ئەم ئایەتەی هێناوە تیایدا پەروەردگارمان فەرمان بە پێویستی تێڕامان لە مەسەلەی بەدیهێنان دەکات کە مەسەلەیەکی نەبینراوە لەلایەن مرۆڤەوە، ئەمەش لە ژمارەیەکی زۆر لە ئایەتەکاندا هاتووە هەروەك دەفەرموویێت:

﴿أَوَلَمْ يَرَوْا كَيْفَ يُبْدِئُ اللَّهُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ ﴿١٩﴾ قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ بَدَأَ الْخَلْقَ ثُمَّ اللَّهُ يُنشِئُ النَّشْأَةَ الْآخِرَةَ إِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٠﴾﴾ (سورەتی العنكبوت: ١٩ــ٢٠).

واتا: ئایا ئەوە سەرنجیان نەداوە چۆن خوا لە سەرەتاوە دروستكراوەكان بەدی دەهێنێتو پاشان دووبارەی دەكاتەوە، بێگومان ئەو شتانە بۆ خوا زۆر سادەو ئاسانە* ئەی پێغەمبەر (ﷺ) پێیان بڵێ: با بگەڕێن بە زەویدا، تەماشا بكەنو سەرنج بدەن چۆن ئەو زاتە دروستكراوەكانی بەدیهێناوە، لەوەودواش هەر خوا سەرلەنوێ بەرپایان دەكاتەوە (بە شێوەو شێوازێكی تر ئاسمانەكانو زەویو ئێمەش دەهێنێتەوە كایە) بەڕاستی خوا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێكدا هەیە.

هەروەها دەفەرموویت:

﴿إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٠﴾ ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا سُبْحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿١٩١﴾﴾ (سورەتی ال عمران: ١٩٠_١٩١).

واتا: بەڕاستی لە دروستكردنی ئاسمانەكانو زەویداو لە ئالۆگۆڕی شەوو ڕۆژدا بەڵگەو نیشانەی زۆر هەن بۆ كەسانی ژیرو هۆشمەند... * ئەوانەی یادی خوا دەكەن لە كاتێكدا بە پێوەن یان دانیشتوون یان ڕاكشاون (لە هیچ حاڵەتێكدا یادی ئەو زاتە فەرامۆش ناكەن)، هەمیشە بیردەكەنەوە لە دروستبوونی ئاسمانەكانو زەوی (بیر دەكەنەوە لە هەموو وردەكارییەك، سەرنجی هەموو دیاردەیەك دەدەن، سەر ئەنجام دەڵێن): پەروەردگارا تۆ ئەم هەموو دروستكراوانەت بێ هودەو بێ ئامانج دروست نەكردووە، پاكیو بێگەردیی شایستەی تۆیە، دە تۆش بمانپارێزە لە سزای ئاگری دۆزەخ.

لێكدانەوەی نێوان ئەم ئایەتە پیرۆزانەو (چەندان نموونەی تر لە قورئانی پیرۆز) ئەوە دەچەسپێنێت كە بەدیهێنانی هەموو

ئاسمانــەکان‌و زەوی‌و بــەدیهێنانی ژیــان‌و مــرۆڤ تــەواوبوو بــە نادیاریەکی تەواو لە ئاگاداریی مرۆڤ (واتا بێ ئەوەی مرۆڤ ئاگای لـێ بێت)، بەڵام لە سایەی بەزەیی خوادا لـە بـەردەکانی زەوی (صـخور الارض)و لـە پەڕپـەڕەی ئاسمـان هەنـدێ دیمـەنی بەرهەستمان بـۆ ماوەتـەوە کـە ناکرێـت مـرۆڤ بـە توانـا سـنووردارەکانی بگـات بـە وێناکردنی چۆنیەتی کـرداری بـەدیهێنان، مەگـەر ئـەوە نـەبێت ئـەو بۆچوونانە تەنها لە بواری گریمانەو بیردۆزەکان ماونەتەوەو هـەرگیز ناکرێت بگاتە جیهانی ڕاستەقینە، چونکە ڕاستی زانستی دەبێت لـە ژێر هەست‌و زانینی مـرۆڤ دابێـت –سـەرەڕای سـنووردارێتی ئـەوە– لێرەدا زانستی بەدەستکەوتوو هەرگیز ناکرێت لە کرداری بەدیهێنان (بە هەرسێ ڕەهەندەکەیەوە) لە قۆناغی بیردۆز تێپەڕ ببێـت، لەبـەر ئەوە چەندان بیردۆزی هەمەچەشن لە بـارەی بەدیهێنانـەوە دانـران بــە هەمەچەشــنی پێــشینەی ئــەو کەســانەی دایاننــاون: ئایــا لــە موسـوڵمانان، یـا لـە بێبـاوەڕان، یـان هاوبـەش پەیداکـەران، یـان ئەوانــەن کــە گومــان لــە ئــایین دەکــەن، یــان ئەوانــەن لــە ژیانــدا بەختەوەرن یان لە کەسانی بەدبەخت، یان لە خەراپـەکاران‌و لـەڕێ دەرچوانن؟...لەم دەریا گەورەیەدا تەنها نورو ڕووناکییەك لە خوای بەرزو پیرۆزەوە بۆ موسوڵمانان ماوەتـەوە لـە ئایەتـەکانی قورئـانی

پـیرۆزدا، یـان فـەرموودەی ڕاسـتو دروسـتی پێغەمبـەر (ﷺ) کـە ئاماژە بە سەرکەوتنی یـەکێك لـەم بیردۆزانـەو پاڵپـشتی کردنـی بـۆ پایەیـەکی ڕاسـتی دەکـات، ئەمـەش لەبـەر ئـەوە نییـە کـە زانـستی بەدەستکەوتوو ئەوەی سەلماندووەو جێگیری کردووە، بەڵکو تـەنها بـوونی ئاماژەیەکـە بـۆ ئـەو ڕاسـتیە لـە قورئـانی پـیرۆزدا یـان لـە سـوننەتی پێغەمبـەر (ﷺ) ئێمـە لـەم بـارەدا توانیمـان زانـست سەربخەین بە هۆی قورئـانی پـیرۆزەوە یـان بـە سـوننەتی دوایـینی پێغەمبەرانو نێـردراوان (علـیهم الـصلاة والـسلام)، بـەڵام زانـستمان سەرنەخستووە بەسەر هەریەك لەم دووانەدا.

بەڵام ئەو ئایەتانـەی قورئـانی پـیرۆز لـە بـواری تـردا ڕوونـی کردوونەتـەوە ناکرێـت بـە بەڵگـە بهێنرێنـەوە لەسـەر پێـشکەوتنە زانستیەکەی، مەگەر بەو ڕاستیە بەڵگە نەویستو جێگیرانـە نـەبێت کە سەلمێنراونو بە پێی ئەم بەرنامە ڕاگیرانەی خوارەوە:-

١ـ تێگەیشتنی باشی دەقی قورئانی پیرۆز بە جۆرێك کـۆك بێـت لەگـەڵ مانـای وشـەکان لـە زمـانی عـەرەبیو یاسـا ڕێزمانییـەکانیو شێوازی دەربڕینی، ئەمەش لەبەر ئەوەی قورئانی پیرۆز بە زمانێکی عەرەبی ڕوونو ئاشکرا دابەزیوە.

٢ـ تێگەیشتن لە هۆیەكانی دابەزینی قورئانی پیرۆزو (الناسخ والمنسوخ) (ئەگەربینرا)و تێگەیشتنی جیاوازی نێوان گشتیو تایبەتیو سنووردارو بێ سنوورو كورتبڕیو درێژبڕی لە ئایەتەكانی قورئانی پیرۆز.

٣ـ تێگەیشتنێك لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) گێڕدرابێتەوەو گەڕانەوە بۆ وتەی ئەو كەسانەی قورئانیان تەفسیر كردووە لە هاوەڵانو شوێنكەوتووانو شوێنكەوتووانی ئەوان تاكو ئێستا.

٤ـ كۆكردنەوەی ئەو خوێندنەوە ڕاستانەی پەیوەندی بەو ئایەتە قورئانیە پیرۆزەوە هەیە ئەگەر هەبێت.

٥ـ كۆكردنەوەی ئەو دەقە قورئانیانەی پەیوەستن بە یەك بابەت، هەندێكیان واتان بۆ هەندێكی تریان بە واتای تێگەیشتنی هەریەكەیان لە ژێر ڕۆشنایی ئەوی تریان لەبەر ئەوەی قورئانی پیرۆز هەندێكی تەفسیری هەندێكی تری دەكات هەروەك چۆن قورئانی پیرۆز بە فەرموودە ڕاستەكانی پێغەمبەر (ﷺ) تەفسیر دەكرێت، لەبەر ئەوە پێویستە فەرموودە ڕاستو دروستەكانی پێغەمبەری نازدار كە پەیوەستە بەو بابەتەی ئایەتەكە مامەڵەی لەگەڵدا دەكات بە یەكەوە بلكێنرێن ئەگەر گونجا، ئەمەش بۆ باش تێگەیشتنی دەقەكانی قورئانی پیرۆز.

٦ـ ڕەچاوكردنی دەقە قورئانیەكان (السیاق القرانـي) بۆ ئەو ئایەتەی پەیوەستە بە یەكێك لە بابەتە گەردوونییەكان بەبێ دابڕان لە دەقی قورئانی ئەوەی كە لە پێشی هاتووەو ئەوەی كە لە دوای دێت.

٧ـ ڕەچاوكردنی ئەو بنەمایەی كە: پەند وەرگرتن بە واتای گشتی ئایەتەكانە، نەك ئەو هۆیەی ئایەتەكەی بۆ دابەزیوە.

٨ـ خۆئەركبارنەكردن یا هەوڵدان بۆ بادانەوەو گونجاندنی ئایەتەكان لە پێناو ڕێككەوتن لەگەڵ ڕاستی زانستی، ئەوەش لەبەر ئەوەی قورئانی پیرۆز بەڕێزترو گەورەترە لە لامان لەوە، چونكە وشەی خوای بەدیهێنەرەو زانیاری خوای بەدیهێنەر بە بەدیهێنراوەكانی ڕاستییەكی ڕەهاو بێ سنوورەو تەواوەو گشتگیرە، هەموو زانستێكی تری داپۆشیوە، ئەم قورئانەش گومان ڕووی تێناكات نە لە ئێستاو نە لە داهاتووشدا.

٩ـ خۆهەڵنەقورتاندن لە كاروبارە پەنهانەكان (غیب) وەك (روح)و فریشتەو جنۆكەو ژیانی بەرزەخ‌و لێپرسینەوەی ناو گۆڕو هاتنی ڕۆژی دوایی‌و زیندووبوونەوەو لێپرسینەوەو تەرازوو (میزان)و پرد (صراط)و بەهەشت‌و ئاگرو ئەوانی تر، خۆبەدەستەوەدان بەو دەقانەی كە لە قورئاندا هاتووە خۆبەدەستەوەدانێكی ئیمانیی

تەواو کە لە باوەڕبوون بە قورئانی پیرۆزو سوونەتی پێغەمبەر (ﷺ) سەرچاوە دەگرێتو بێهێزیی مرۆڤ لە گەیشتن بە بەهاو شێوەی ئەم پەنهانە ڕەهایە.

١٠ـ دڵنیابوون لەوەی ڕۆژی دوایی یاساو ڕێسای خۆی هەیە جیاوازە لە یاسای دونیاو پێویستی بەم یاسا دونیاییە یەك جۆریە نییە، بەڵکو بە شێوەیەکە خوا وەسفی دەکات بۆمان بە داوایەکی لە ناکاوی خوای گەورەی بەرزو باڵا واتا بە فەرمانی (کن فیکون، ببە دەبێت) واتا لە نێوان پیتی کافو نون، خوای گەورە ڕاستی فەرمووە:

﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا ۖ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ رَبِّى ۖ لَا يُجَلِّيهَا لِوَقْتِهَآ إِلَّا هُوَ ۚ ثَقُلَتْ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ لَا تَأْتِيكُمْ إِلَّا بَغْتَةً ۗ يَسْـَٔلُونَكَ كَأَنَّكَ حَفِىٌّ عَنْهَا ۖ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ ٱللَّهِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨٧﴾ ﴾ (سورەتی الاعراف: ١٨٧).

واتا: ئەی محەمەد (ﷺ) پرسیارت لێدەکەن دەربارەی ڕۆژی دوایی: کەی بەرپا دەبێت؟ پێیان بڵێ: بە ڕاستی زانینی کاتی بەرپابوونی هەر لای پەروەردگارمە، لە کاتێکدا کەس لە ساتو کاتی خۆیدا دەری ناخاتو بەرپای ناکات زاتی پەروەردگار نەبێت،

بەرپابوونی ڕۆژی دوایی زۆر گرانەو زۆر دەكەوێت لەسەر دانیشتووانی ئاسمانەكانو زەوی (چونكە شیرازەی هەمووی تێك دەچێتو لێك هەڵدەوەشێت) ڕۆژی دوایی بەرپا نابێت كتوپڕ نەبێت، لە پڕ یەخەتان پێدەگرێت، وا پرسیارت لێدەكەن هەروەك تۆ زۆر عەودالّی زانینی هاتنی ڕۆژی دوایی بیتو پرسیاری زۆرت لە بارەیەوە كردبێت!! پێیان بڵێ: بەڕاستی زانینی بەرپابوونی ڕۆژی دوایی تەنها لای خوایە، بەلاّم زۆربەی خەڵكی نازانن.

سەرەڕای ئەوەش لە میهرەبانی خوای بەرزو بالاّ بۆمان، لە بەردەكانی زەویو لە پەڕپەڕەی ئاسمان ژمارەیەكی زۆر لە بەڵگەی بەرهەستیی بۆمان هێشتووەتەوە كە بەستراوە بە لەناوچوونی گەردوونو ڕوودانی ڕۆژی دواییو ئاماژەكردن بۆ ئەو بەڵگە گەردوونیانە كە ناكرێت ڕاڤە بكرێت بە هەوڵدان بۆ زانینی كاتی داهاتنی ڕۆژی دوایی، چونكە ئەمە پەنهانێكە لە پەنهانە ڕەهاكان كەس نایزانێت تەنها خوا نەبێتو لەبەر ئەوە بەم ڕێسا گەردوونیە بەرچاوانە تەواو نابێت لەم ژیانەدا.

١١ـ دانانی ئەو ڕاستیە زانستیانەی كە گەڕانەوەو پەشیمان بوونەوەی تێدا نییە لە بەڵگەهێنانەوە لەسەر ئیعجازی زانستی بۆ ئایەتێك یا ئایەتەكانی قورئانی لە بابەتێك یان چەند بابەتێكی

یەکتر تەواوکەر، ئەمەش لە هەموو ئەو ئایەتانەی لە بارەی گەردوونەوە هاتووە لە قورئانی پیرۆزدا بێجگە لە باسی بەدیهێنانو لەناوچوونو ئەو زیندووبونەوەی دەشێت ئایەتی قورئانی پیرۆزی تێدا دابنرێت بۆ هەڵبژاردنو پاڵپشتیکردنی یەکێك لە بیرۆکە پێشنیارکراوەکان لەسەر پایەیەکی ڕاستو دروست.

١٢ـ ڕەچاوکردنی کارامەییو پسپۆڕیەکی ورد لە قۆناغەکانی جێگیرکردنی ڕووی ئیعجازی زانستی لە ئایەتە پیرۆزەکانی قورئاندا، چونکە ئەوە بوارێکی تایبەتمەندە لە بەرزترین قۆناغەکانی کارامەییو تایبەتمەندێتی نابێت هەموو کەسێك خۆی تێهەڵبقورتێنێت، هەروەك چۆن ناکرێت بۆ کەسێك هەموو لایەنەکانی ئیعجازی زانستی دابپۆشێت کە زیاتر لە هەزار ئایەتی قورئانیی ڕوونو ئاشکرایە، سەرەڕای چەندانی تر کە بەڵگەکانی لە ڕاستی نزیك دەکەونەوە، ئەم ئایەتانە سنوورێکی بێشوماری بڕیووە لە زانستی بەدەستکەوتوو لە زانیاری کۆرپەلەزانی تا زانستی گەردوونناسیو لە نێوانیشیان لە بوارە جیاوازەکانی زانستو زانیاری مرۆڤایەتیدا.

١٣ـ لەبەرچاوگرتنی توانای دەستپێکردن لە ئایەتە قورئانیە پیرۆزەکان بۆ گەیشتن بە ڕاستی گەردوونی وەها کە زانستی

بەدەستكەوتوو نەتوانێت بگاتە هیچ شتێك لێی لـە داهاتووشـدا، بـە دەستپێكردن بە بیروباوەڕێكی تەواو بـەوەی قورئـانی پـیرۆز وتـەی خـوای بەدیهێنــەرە، لــە ڕوونــی پەروەردگاریەتییەكـەیو تیـشكە ڕووناكیەكەی، ئەوەش هەمووی ڕاستیەكی ڕەهایـەو بەتاڵبوونـەوەی نییە نە لە ئێستاو نە لە داهاتووشدا.

١٤ــ بەكەم ڕانەگرتنی هەوڵدانی زانایانی پێشووتر لـەو هەوڵدانـە دڵـسۆزانەی كـە دایـان بـۆ تێگەیـشتن لـە بەڵگـەی ئـەو ئایەتـە گەردوونیانە لـە سـنووری زانیارییـە دەسـتكەوتووەكانی سـەردەمی خۆیان، ئەمەش چونكە ئایەتی گەردوونی هاتوو لـە قورئـانی پـیرۆز بەڵگـەكانی فــراوان دەبێــت لەگــەڵ فراوانبــوونی بازنــەی زانیــاری مرۆڤایەتی لە تـەواوكاریو دژایـەتی نازانێـت، تـاكو قورئـانی پـیرۆز ببێتە پەناگەیەك بۆ زانیارییە مرۆڤایەتییەكان هەرچەندە بازنەكـەی فراوان بێت، ئەمـەش گـەورەترین لایەنـەكانی ئیعجـازە لـە قورئـانی پیرۆزدا.

١٥ــ جیاكردنەوە لـە نێـوان هـەردوو بابـەتی ئیعجـازی زانـستیو ڕاڤـەی زانـستی قورئـانی پـیرۆز، ئیعجـازی زانـستی مەبەسـت پێـی لێــرەدا ئەوەیــە (جێگیربــوونی پێــشەنگیی قورئــانی پــیرۆز بــە ئاماژەكردن بۆ ڕاستیەك لە ڕاستییەكانی گەردوون یان لێكدانـەوەی

دیاردەیەك لە دیاردەكان پێش گەیشتنی زانستی بە دەستكەوتوو پێی بە چەند سەدەیەك)، بەلاّم ڕاڤەكردن (هەولّدانێكی مرۆڤایەتییە بۆ باش تێگەیشتنی بەلّگەی ئایەتی قورئانی ئەگەر كەسی ڕاڤەكار (مفسر) لێكدانەوەكەی ڕاست بوو دوو پاداشتی هەیە لای خوا، بەلاّم ئەگەر لێكدانەوەكەی هەلّە بوو یەك پاداشتی بۆ هەیە)، ئەوەی پشت ئەستوورە پێی نیەتو مەبەستیەتی، لێرەدا پێویستە دلّنیا بین لەوەی هەلّە لە لێكدانەوەی قورئاندا دەگەڕێتەوە بۆ كەسی شیكەرەوە (مفسر)و ناگەڕێتەوە بۆ مەزنیی قورئانی پیرۆز.

١٦ــ پێویستە لێكۆلّینەوە بكرێت لەسەر وردەكارییە لەبن نەهاتووەكان لە هەلّسوكەوتكردن لەگەلّ كتێبی خوداداو دلّسۆزیی نیەتو خۆیەكلاییكردنەوە بۆی لە هەموو مەبەستێكی تر وو بیركردنەوە لە وتەی پێغەمبەر (ﷺ) كە دەفەرموویت: ((من قال في القران بغير علم فليتبوأ مقعده من النار)).

واتا: (هەر كەسێك بە پێی هەواو ئارەزووی خۆی شتێك دەربارەی قورئان بلّێ بەبێ زانستو زانیاری با جێگایەك لە دۆزەخ بۆ خۆی دەستنیشان بكات).

## هۆیەكانی بایەخدان بە بابەتی ئیعجازی زانستی لە قورئانی پیرۆز ئەمانەن:

یەكەم: قورئانی پیرۆز بۆ ئەوە دابەزیوە بۆمان تاوەكو لێی تێبگەین، ئەو ئایەتە گەردوونیانەی كە تێیدایە ناكرێت بە باشی لێی تێبگەین تەنها لە چوارچێوەی زماندا، ئەمەش لە گشتگیریی بەڵگەی قورئانیەو بۆ هەموو زانیاریەك كە بەش بەشی تێدا نییە.

دووەم: بانگەوازكردن بە ئیعجازی زانستی لە قورئانی پیرۆزو سوننەتی پاكی پێغەمبەر (ﷺ) هۆكارێكی گونجاوە بۆ خەڵكی ئەم سەردەمەمان، سەردەمی زانستو تەكنیكو وردەكاریی، خەڵكی شەیدای زانستو دەسكەوتەكانی بووە بە شێوەیەكی زۆرو وازیان لە ئایین هێناوەو پشتگوێیان خستووەو لە بیریان كردووەو خۆیان لە بەدیهێنراوو خوای بەدیهێنەر نەناس كردووە، هەروەك خۆیان لە زیندووكردنەوەو لێپرسینەوەو بەهەشتو ئاگری دۆزەخ نەناس كردووەو خۆیان لێی بێ ئاگا كردووە، جگە لەوەش لە شتە پەنهانەكان، چونكە ئەم دەستوورو بناغەیە بەشێوەیەكی گەورە شێوێنراوە لە بیروباوەڕیانو قەناعەتیان بۆ ناگەڕێتەوە، لەبەر ئەوە هۆكارێكی باوەڕپێهێنەرو قەناعەت هێنان بە ئایین بۆ خەڵكی ئەم

سەردەمە نەماوە بە ڕادەی ئیعجازی زانستی لە قورئانی پیرۆزو سوننەتی دوایینی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام).

**سێیەم:** بناغەی شارستانیەتەکان ئەوەیە یەکتر تەواو دەکەنو ململانێ لەگەڵ یەکتردا ناکەن، بەڵام لەم ڕۆژگاری عەولەمەیەی ئێمەی تێدا دەژین، شارستانیەتی ماددی هەوڵی زاڵبوون دەدات بەوەی کە تێیدایە لە کوفرێکی ئاشکراو هاوبەش پەیداکردنی ئاشکرا بۆ خوا بۆ گەڕانەوەی بەها خەراپە لە دەستچووەکانیو ڕەوشتە نزمەکانیو ماددیە داپلۆسێنەرەکانی بۆ سەر شارستانیەتەکانی تر، دانانو بەکارهێنانی هەر هۆکارێك کە دەستیان دەکەوێت لە دەزگای داگیرکردنی ماددیو هۆکارەکانی.

لەم ڕۆژگارەشدا زۆرێك لەو هەموو دەزگا ماددیانە بە دەستی موسوڵمانان لە دەست دەدرێن لە ئەنجامی ئەو زنجیرە پیلانە دوورو درێژانەی دوژمنان، بە داگیرکردنی زۆربەی وڵاتانی موسوڵمانانو کارکردن لەسەر بە ڕۆژئاواییکردنیان، دوای هەوڵدانو تێکۆشانێکی زۆر لە پێناو ڕووخانی دەوڵەتی خەلافەتی ئیسلامی ئەمەش دوای لاوازکردنو بێ دەسەلاتکردنیو پاشان ڕووخاندنو لەناوبردنی بە تەواویو کارکردن لەسەر پارچەپارچەکردنی نەتەوە بۆ زیاتر لە پەنجاو پێنج دەوڵەتو دەوڵەتۆکەو تالانکردنی هەموو

خێروبێرو سەروەتو سامانەكەیو دانانی چەند جۆرە حوكمێكی دژ بەیەك لەم ولآتانەدا بۆ ئەوەی نەتوانن یەك بگرنەوە، لەم ڕۆژگاری دابەشبوونە مرۆڤایەتیە گەورەیەی تێیدا دەژینو دوایی چاندنی قەوارەی زایۆنیی نامۆ لە دڵی نەتەوەی ئیسلامی بۆ فەسادكردنو پیسكردنیو ورووژاندنی شەڕو شۆڕو پەشێویو ئاژاوە لە نێوان نەوەكانیداو چاندنی دوژمنایەتی لە نێوان براكان بۆ ڕێگرتن لە یەك گرتنیان، ڕەنگدانەوەی بیروباوەڕی لەناوبەرو ڕەفتاری هەڵگەڕاوەو ڕەوشتە داڕووخاوەكان بۆ چەسپاندنی وردوخاشكردنی نەتەوەی موسوڵمانانو كاركردن بۆ زیاتر بە ڕۆژئاواییكردنیانو ئاسانبوونی خۆسەپاندن بەسەریداو هیچ بە دەستی نەتەوەی ئیسلامی دانەماوە لەم ڕۆژگارە تەنگەی تێیدا دەژین تەنها ئایینەكەی نەبێت، ئەو ئایینە كۆتاییەی خوای بەرزو پیرۆز بە هیچ ئایینێكی تر ڕازی نابێت لە بەندەكانی جگە لەو ئایینە نەبێت كە ئیسلامە، هەر ئەمەش تاكە هۆكارێكی بەرگریكردنە بە دەستی موسوڵمانانی ئەم ڕۆژگارە ماوەتەوەو ڕوونترین هۆكار بۆ بەرزڕاگرتنی بەڵگە لەسەر بەندەكان لەم ڕۆژگاری زانستو زانیارییەی تێیدا دەژین بریتییە لە ئیعجازی زانستی لە قورئانی پیرۆزو لە سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ).

**چوارەم:** لـەم ڕۆژگـارەدا هەریـەك لـە ئیـسلامو موسـوڵمانان لـە هەموو هۆکارەکانی ڕاگەیاندن بە ناحەق ڕووبەڕووی هێرشـی دڕنـدە دەبنـەوە، ئـەوان لـە هێرشـەکەیاندا نکـۆڵی لـەوە دەکـەن ئیـسلام ئـاینێکی ئاسمـانیو قورئـان وتـەی پـەروەردگار بێـت نکـۆڵی پێغەمبەرایـەتی دوایـین پێغەمبـەر (ﷺ) دەکـەن لەبـەر لـەخۆباییو چەقاوەسـووییان، جـا گـرینگترین هۆکـارو بـە سـوودترینیان بـۆ بەرپەرچدانەوەی ئەم هێرشانە جێگیرکـردنو چەسـپاندنی ئیعجـازی زانستییە لە قورئانی پیرۆزو سوونەتی پێغەمبـەر (ﷺ) بـە وشـەی خۆشو بەڵگەی ڕوونو ئاشکراو تەواوو ئاخاوتنی ئاسایی.

**پێنجـەم:** جیهـانی ئـەمڕۆ بـە ئاراسـتەی کارەسـاتێکی گـەورە دەجوڵێ کە سەرچـاوەکەی گەشـەکردنی زانـستو تەکنیککاریـەکی سەرسـوڕهێنەرەو بـە جۆرێـك خاوەنەکـەیان بـەرەو سـتەمکاری دەباتو فریویان دەدات بە سڕینەوەو لە ناودانی کەسانی دیکـە لـە کـاتی لـە ئارادانـەبوونی هۆشـیاری ئـایینی دروسـتو پابەنـدبوونی ئەخلاقیو هەڵسوکەوتی کە ڕەچاوی مافـەکانی برایـەتی مرۆڤایـەتی دەکات بە باشترین شێوە، دەربازبوون لەم سەرگەردانیە بریتییە لە بانگەواز بۆ ئایینی دروست، لە ڕوونترین شێوازەکانی بانگـەواز بـۆی بریتییە لەوەی لە قورئانی پـیرۆزو لـە سـوونەتی پێغەمبـەر (ﷺ)و

ئیعجازی زانستی ڕوون وەك ڕووناكی خۆر لە كاتژمێری چواری ڕۆژدا.

**شەشەم:** ئێمەی كۆمەڵی موسڵمانان زۆر كەمتەرخەم بووین لە گەیاندنی پەیامی خواو پێغەمبەری خوا (ﷺ) كە داوای ئەوەشمان لێكراوەو ئێمە بەرهەمی ئەو كەمتەرخەمییە هەموو ڕۆژێك دەدوورینەوە: جەنگێكی تێكشكێنەر لەسەر خاكی موسڵمانان لە فەلەستین تاكو بەلقانو لەوێوە بۆ خاكی شیشانو كشمیرو ئەفغانستانو ئەراكانو باشوری فلیپینو سودانو سۆماڵو ئەوانی تریش، گەمارۆی زۆربەی دەوڵەتە موسڵمانەكانو دەست بەسەرداگرتنی ملیارەها دۆلار لە موڵكی موسڵمانان، داگیركردنی سەربازیی هەموو زەوی فەلەستینو دەوڵەتەكانی كەنداوی عەرەبیو ئەفغانستانو سبتەو مەیلیلیەو دورگەی لەیلا، لە زەوییەكانی مەغریبیو زۆر لە دوورگەكانی ئاسیاو ڕاوەدونانی موسڵمانان لە هەموو شوێنو جێیەكانی جیهانو پتەوكردنی پیلانگێڕان بۆ سەریان.

**حەوتەم:** لە وروژاندنی باسی ئیعجازی زانستی لە قورئانی پیرۆزداو لە سوننەتی كۆتا پێغەمبەر (ﷺ) ڕاپەڕاندنی بیروهۆشی موسڵمانانە، ئاماژە بۆ بیركردنەوەی داهێنانكارانە تێیدا، هاندان

لەسەر گەڕانەوەی گرنگیدان بە کاری زانستو وردەکاری کە نەتەوە تێیدا دواکەوت بەشێوەیەکی گەورە، لەو کاتەی دەوڵەتی کوفرو شیرکو گومڕا پێشکەوتوونە، پێشکەوتنێکی سەیر، تاکو گەیشتە ئەوەی چەندێتی زانستی بەردەست هەر پێنج ساڵ جارێك تا ڕادەیەك چەندجارەی خۆی دەبووەوە، لایەنە تەکنیکیەکانی (تقنية) هەر سێ ساڵ جارێك نوێ دەبووەوە، بەمەش کەلێنێکی ناوبڕی لە نێوان ئێمەو ئەواندا دروستکرد لە بواری زانستو تەکنیك کە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاد دەکاتو قووڵتر دەبێتەوە، سامناکی ئەوە لە سەرمان وای لێهات چەندجارە ببێتەوە لەگەڵ زیادکردنی ئەو کەلێنە قووڵو بەرفراوانە.

# لە ئایەتەكانی ئیعجازی زانستی لە قورئانی پیرۆز:

## هەندێك نموونە لە ئاماژەكانی قورئانی پیرۆز بۆ زەویناسی (geology)

قورئانی پیرۆز لە ژمارەیەك لە ئایەتەكانیدا ئاماژە بۆ گەردوون و پێكهاتەكانی دەكات (ئاسمانەكان، زەوی، هەموو ئەوانەی تێیدایە لە وێنەی گیاندارو بێگیانەكان و دیاردەو كردارە جیاوازەكان)، ئەم ئایەتانە بە سێ پلەی بنچینەیی سنووردار هات، لەسەر ئەم شێوەیەی خوارەوە:

١ـ پلەی بەڵگەهێنانەوە لەسەر بەدیهێنەری مەزن لە میانەی ناساندنی لەسەر داهێنانی دروستكردن لە دروستكراوەكانی، دەوردانی (پەی پێ بردنی)و داناییە زۆر لە ڕادەبەدەرەكەی، ڕەهایی هێزەكەی كە هەموو شتێك شایەدی بۆ دەدات بە پەرستراویەتی و پەروەردگاریەتی هەتاهەتایی لەسەر هەموو بەدیهێنراوەكانی.

٢ـ پلەی شایەتیدان لەسەر ئەوەی ئەو بەدیهێنەرە مەزنەی ئەم گەردوونەی بەدیهێناوە بە زانست و دانایی و توانای خۆی دەتوانێت و دەسەڵاتدارە لەسەر لەناوبردنی بەدیهێنراوەكانی و لەسەر

زیندووکردنەوەی سەر لـەنوێ، کـرداری زیندووبوونـەوە بڕوبیـانووی کافرەکـانو گومـان لەدڵـەکانو بێباوەڕەکـان بـوو لـە مێـژوودا بـۆ بێهێزکردنیان لە تێگەیشتنی ئاشکرایی تواناو هێزی ئیلاهی.

٣ـ پلەی بەڵگەهێنانەوە لەسەر تـاکێتی بەدیهێنـەری مـەزن، بـە بێ هاوەڵو لێکچووە (کەس لـەو ناچـێت)، نـە هاوشـانی هەیـە، نـە هـاوەڵو نـە نـەوەی هەیـە، چـونکە هـەموو بـەدیهێنراوەکانی دروسـتکردووە لـە جـووتێکی ئاشـکراو دیـار (لـە مـاددە بنـچینەییە یەکەمییـەکان تـاوەکو مـرۆڤ) تـاکو خـوای مـەزن بـە تـاكو تـەنها بمێنێتەوە لەسەر هەموو بەدیهێنراوەکانی.

ئەم ئایەتە گەردوونیانە سەرەڕای سێ بەڵگە سەرەکیەکە، وەك وتارێك بۆ خەڵکی ئەم سەردەمەمان ماونەتەوە، ئەوانـەی فریـودران بە زانستو تەکنیكو دەرئەنجامەکانی بە شێوەیەکی گەورە، وتارێك جێگیر دەبێت بۆ هەموو بەرچاوڕوونێك قورئـان لـە پێـشدا ئامـاژەی کردووە بۆ ژمارەیەك لە ڕاستیە گەردوونیەکان پێش گەیشتنی مـرۆڤ پێی بە چەند سـەدەیەکی درێـژ، ناکرێـت کەسـێکی ژیـرو هۆشمەنـد سەرچـاوەیەکی تـر بـۆ ئـەم زانـستە بڕیـار بـدات جگـە لـە خـوای بەدیهێنـەری بـەرزو پـیرۆز لـە کاتێکـدا نـەدەکرا کەسـێك لـە بەدیهێنراوەکان کەمترین شارەزایی هەبێت بەو ڕاستیانە، لـە کـاتی

دابـــەزینی قورئـــانی پـــیرۆز (لـــە ســـەرەتای ســـەدەی حەوتـــەمی زایینی)یەوە نە لە دوای چەند سەدەیەكی دوورودرێژ لە دوای ئەوە، زۆربەی ئەو ڕاستیە گەردوونیانە مرۆڤ پێی نەگەیشتووە، تـەنها لـە سـەدەی بیستەمدا نـەبێتو نەدەگەیشت پێـی تـەنها دوای هـەوڵو خەباتێكی وا بە هەوڵی هـەزاران زاناو بـە دەیان سـاڵی خایانـد بـۆ گەیشتن بەو زانستە.

ئـەم پێشكەوتنە قورئانیـە بـە ژمارەیـەك لـە ڕاسـتی گـەردوونی بەڵگەیەكی ماددی دیارو ئاشكرایە بۆ خەڵكی ئەم سەردەمە، بەوەی قورئـانی پـیرۆز وتـەی خـوای بەدیهێنـەرەو دوا پێغەمبـەری (ﷺ) پەیوەست بوو بە وەحیو نیگاو فێریش كرابوو لە لایەن بەدیهێنەری ئاسمانەكانو زەوی.

لەو ڕووەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە ئەو ئایەتە گەردوونیانە لە قورئانی پیرۆز بـۆ هـەواڵی زانـستی ڕاسـتەوخۆ نـەهاتووە، ئـەوەش لەبەر دوو هۆی ڕوونو ئاشكرایە:

**یەكەمیان:** قورئـانی پـیرۆز لـە بنـچینەدا بریتییـە لـە پـەرتووكی هیدایەت بـۆ مرۆڤـەكان لـەو كارانـەی مـرۆڤ ناتوانێـت یاسـای ڕێـكو ڕاست بۆ خۆی دابنات یان لە بـوونی هێـزی پـەنهانی ڕەهـا ناكرێـت مرۆڤ بە هەستو توانا سنووردارەكانی ژیریی خۆی تێی بگـات، وەك

باسی بیروباوەڕ (العقیدة)و لە نێوانیاندا باوەڕبوون بە خواو فریشتەکانو پێغەمبەرانو کتێبەکانیانو ڕۆژی دوایی.

یان لە بوونی کارەکانی پەرستن، پەرستن بە واتا زمانەوانیەکەی واتا ئەوپەڕی ملکەچییە بۆ خوا لە گوێڕایەڵیکردنیدا، هیچ بەگوێکردنێکیش نیە بەبێ (امر)و داوالێکردن، ئەگەر مرۆڤ ڕوونکردنەوەیەکی نەبینی لە خوای گەورەوە کە چۆنیەتی پەرستنی بۆ دیاری بکات، ئەمەش سەردەکێشێت بۆ پەنابردن بۆ داهێنانو داهێنانی مرۆڤیش لە پەرستندا ڕەتکراوەیە، جا ناکرێت کەسێکی ژیر وای بۆ بچێت دەتوانێت شێوەیەك لە پەرستن دابهێنێت بۆ خۆیو دوایی داوای لێوەرگرتنی بکات لە خوای بەرزو پیرۆز، چونکە خوای گەورە پێی خۆشە بەو شێوەیەی خۆی داوا دەکات بپەرسترێت.

یان لە بوونی لە ڕێکخستنی هەڵسوکەوتەکان وەك کاری ڕەوشتو کڕینو فرۆشتن، مێژوو بە بەردەوامی شکستی مرۆڤمان بۆ دووپاتدەکاتەوە لە هەموو ئەو هەوڵانەی دەیدات لە پێناو دانانی کۆنترۆڵکاریەکانی ڕەفتار لە داهێنانی خۆیەوەو نموونە لەسەر ئەوە زۆرترە لەوەی کە بژمێردرێت.

**دووەمیان:** زانیاری لەسەر گەردوون و توێژینەوەی شتە سروشتیەكانی خودا تێیداو دانانی هەموو ئەوەی بە باش هەڵسان بە پێویستی جێنشینی لەسەر زەوی و بەرپاكردنی دادی خوایی تێیدا لە پێویستیەكانی مرۆڤەو وازی لێهێنراوە بۆ قسە لەسەركردن و (اجتهاد) لە ناو خۆیان وەچە دوای وەچەو نەوە دوای نەوە، بە گوێرەی سروشتی لەسەریەك كۆبوونەوەی زانیاری جێگیری مرۆڤ لە سنوورداریەتیی توانا مرۆڤایەتییەكان، ئەگەر سالانە زۆرو دوورو درێژەكانی خودایی و رێكخستنە دوای یەكەكانی نەبووایە، مرۆڤ نەیدەتوانی هیچ شتێك لە زانستی گەردوون بزانێت.

لە كاتێكدا قورئانی پیرۆز وشەی خوای بەدیهێنەرە، ئەوەی ئەم گەردوونەی بە دیهێناوە بە زانستی خۆی و بە داناییەكەی و بە هێزو توانای خۆی، جا هەر دەبێ هەموو وشەیەك تێیدا ڕاستییەكی ڕەهاو تەواوی تێدا بێت چ لە لایەنی ئایینی بێت بە هەر چوار كۆڵەكە بنچینەییەكەیەوە: بیروباوەڕ (عقیدة)، پەرستن (عبادة)، ڕەوشت و ئاڵوگۆڕ یان لە لایەنی چیرۆكی قورئانی، یان پێشبینیكردنی داهاتوو، یان لە لایەنی وتاری بۆ دەروونی مرۆڤایەتی، لە هەڵسوكەوتە پەروەردەییە بێ هاوتایەكەی لە پێهەڵسانی و ئاماژەكردن بۆ گەردوون و ئەو شتانەی تێیدایەو

دیاردەکـانیو سـونەتەکانیو بناغـەی دروسـتکردنو بـەدیهێنانیو ڕێگـەکانی لەناوچـوونو دووبـارە وەدیهێنانـەوەی یـان لـە لایـەنی دەربـڕینو ڕسـتەو پێکهاتـەکانیو شـێوازە ڕوونەکـەیو ڕێکخـستنە زمانەوانییەکەیو بەشـکردنی بـە شـێوەیەك لـە داڕشـتن کـە پێـشتر عەرەب نەیاندەزانی: جا نە بە پەخشانو نە بە هۆنراوە، تەحەددای عەرەب -کە لە بـەرزترین لوتکـە بـوون لـە لوتکـەکانی ڕەوانبێـژیو زمانـەوانیو باشـیی ڕوونکردنـەوە- کـە نموونەیـەك وەك قورئـان بهێننەوە یان بە دە سورەت وەك ئەو یان هـەتا بـە سـورەتێك وەك ئەو بهێننەوە بێ ئەوەی کەسـێکی ژیـر بتوانێـت شـتێك لـە بـارەی ئەمەوە پێشکەش بکات.

ئەمانەو دەیانی تر جەخت دەکات لە سەر وردێتی هـەموو پیـتو وشەو ئاماژەیەك لە قورئانی پیرۆزو ئەوەی تێیدایە لـە ئامـاژەی بـۆ گەردوونو ناوەڕۆکەکەیو کردارەکانیو دیاردەکانی، ئەوە کتێبێکـە پێش١٤٠٠ ساڵ دابەزیوە بۆ سەر پێغەمبەر (ﷺ)ی نەخوێندەوار لە نەتەوەیەك زۆربەی زۆری لە نەخوێندەواران بوون، لـە کاتێکـدا لـەم سەردەمی زانستو وردەکاریەی ئەمڕۆ تێیدا دەژین شایەدی دەدەن بـەوەی قورئـان وشـەی خـوای بەدیهێنـەرەو شـایەدی دەدات بـە پێغەمبەرایەتیو پەیامەکەی پێغەمبەری کۆتایی کە وەریگرت.

لەو ئایەتە گەردوونیانەی قورئانی پیرۆز، كە باسی زەوی دەكات (٤٦١) ئایـــەتی پـــیرۆزە، لەوانـــە (١١٠) لـــەو ئایەتانـــە ئامـــاژەی ڕاستەوخۆ بۆ ڕێزمانی سەرەكی زەویزانی دەكەن، ئەمەش دەتوانین دابەشی بكەین بۆ ئەم كۆمەڵانە:-

١ـ ئەو ئایەتانەی داوا لە مـرۆڤ دەكـات بـە سـەر زەویـدا بـڕوات، ڕوانین لە چۆنیەتی دەستپێكردنی دروستكراوەكان {وەك لە ئایەتی ژمارە ٢٠ لەسـوڕەتی (العنكبـوت)}و نمونـەی ئـەو ئایەتانـە ئامـاژە دەكـات بـۆ بەرنامـەی بنـچینەیی زانـستی لـە لێكۆڵینـەوەكانی زەویناسی.

٢ـــ ئـەو ئایەتانـەی ئامـاژە بـۆ شـێوەو جوڵـەو گەشـەی زەوی دەكات، لەو ئایەتانەی وەسفی خڕیـی زەوی دەكـەن، هەیـە ئامـاژە دەكات بۆ سوڕانەوەی زەوی بەدەوری تەوەرەكەیـدا، هەیـە ئامـاژە دەكات بۆ سوڕانەوەی لە خولگەكەی بەدەوری خۆردا، هەیە ئامـاژە دەكات بۆ دووریی زۆری ئەستێرەكان لە ئێمەوەو لە یەكترەوە، یان بۆ ڕاستێتی فراوانبوونی گەردوونو بۆ گەشەكردنی بۆ تەنۆچـكەیەك -قۆنـاغی داخـران یـان چـوونەوەیەك (مرحلـة الرتـق) دوایـی تەقینەوەی ئەو تەنۆكەیە- قۆناغی لێك جیابوونەوە (مرحلة الفتق)و تێپەڕبوونی ئاسمان بە قۆناغەكانی بەدیهێنانی یەكەمی بـە قۆنـاغی

دوکەڵی (دخان) یان ئاماژە بۆ ماددەی نێوان ئاسمانو زەویو بۆ بە دوای یەکداهاتنی گەردوونو بۆ شتی تری بێجگە لەوانە لە ڕاستیەکانی زەویو پەیوەندیی بە ئاسمانەوە (واتا بە ئەوانەی ماون لە گەردووندا).

٣- تاکە ئایەتێکی قورئانی دەیسەلمێنێت هەموو ئاسنی سەر هەسارەکەمان بە دابەزین لە ئاسمانەوە دابەزیوەو ئاماژە دەکات بۆ تواناو هێزی ئاسنی ڕەقو سوودی زۆری بۆ خەڵکی (سوڕەتی (الحدید) ئایەتی ژمارە ٢٥ دوای بەسمەلە).

٤- تاکە ئایەتێکی قورئان ڕاستی درزبردنو شەقبردنی زەوی دەسەلمێنێت (الطارق: ١٢)و ئەوەش لە ڕاستیە سەرەکیەکانە لە زەوییەکەمان.

٥- زۆرێك لە ئایەتە قورئانیەکان لەسەر ژمارەیەك دیاردەی دەریایی گرینگ دەدوێن وەك تاریکی تەواوو ڕەشیی تەواوی بنکی هەموو دەریا قوڵەکانو هەموو زەریاکانو خولی هەر یەك لە هەورو شەپۆلی سەر ڕووی دەریاو شەپۆلە قوڵەکان لە ڕوودانی ئەم تاریکیە بە دوای یەکدا هاتووە لەسەر یەکتر.




وێنەیەك چینەکانی زەوی ڕوون دەکاتەوە، پێك دێت لە ناوکێکی ناوەکی: کرۆکی ڕەق لەسەر شێوەی تۆپێکی گەورە، ڕێژەی ئاسن تێیدا دەگاتە٩٠٪، بەدوایدا ناوکی دەرەکی دێت، دوایی کەوڵی زەوی کە لە سێ چین پێکدێت، دوای ئەویش بەرگی بەردینی زەوی، ڕێژەی ئاسن لە کرۆکی زەوی بۆ دەرەوە بە بەردەوامی کەم دەکات تا دەگاتە ٥,٧٪.




وێنەیەك چینەكانی زەوی ڕوون دەكاتەوە، پێك دێت لە ناوكێكی ناوەكی: كرۆكی ڕەق لەسەر شێوەی تۆپێكی گەورە، ڕێژەی ئاسن تێیدا دەگاتە٩٠٪، بەدوایدا ناوكی دەرەكی دێت، دوایی كەوڵی زەوی كە لە سێ چین پێكدێت، دوای ئەویش بەرگی بەردینی زەوی، ڕێژەی ئاسن لە كرۆكی زەوی بۆ دەرەوە بە بەردەوامی كەم دەكات تا دەگاتە ٥,٧٪.

٦ـ ژمارەیەك لە ئایەتی قورئان باس لە چیاكان دەكەن، لەوانە ئایەتێك وەسفی چیا دەكات بەوەی وەك مێخە (اوتاد)و بەوە وەسفی هەموو شێوەی دەرەوەی دەكات (ئەوەش سەرەڕای گەورەییەكەی بەشێكی بچووك لە چیا دەنوێنێت)و درێژبوونەوە ناوەكیەكەی (نۆ تا چواردە چەندجارەی بەرزی چیا لەسەر ڕووی ئاستی دەریا پێكدەهێنێت‌و بەوە زۆربەی قەبارەی چیا پێك دەهێنێت)، دە ئایەتی دواتر وەسفی كاری بنچینەیی چیا دەكات لە جێگیركردنی پلێتەكانی بەرگی بەردینی زەوی‌و جێگیركردنی زەوی وەك هەسارە لە خولانەوەی بە دەوری تەوەرەكەی‌و كەمكردن لە هاوكێشە لاریەكەی. هەر بەو شێوەیەش مێخەكەی: زۆربەی لە ژێر زەویدایەو كەمێكی دیارە لەسەر زەوی‌و كارەكەی جێگیركردنە. قورئانی پیرۆز لە دە ئایەتی پیرۆزی وەسفی ئەو ڕۆڵەی چیا دەبینێت دەكات وەك قوچەك (رواسي) بۆ جێگیركردنی پلێتی بەرگی بەردینی زەوی‌و ڕاگیركردنی زەوی بە گشتی‌و بەدیهێنانی هاوسەنگییەكەی لە خولانەوەی بە دەوری تەوەرەكەی لە بەرامبەر خۆردا، قورئانی پیرۆز جەختدەكاتەوە لەسەر كاری چیایەكان لە بیست‌و دوو ئایەتی تری ڕووندا، بۆ سیفەتی قوچەكە سەربڵندەكان

(رواسي شامخات) سیفەتی تر زیاد دەكرێت لەوانە: ڕۆڵی چیاكان لە خولانـەوەیان بـە دەوری زەوی، بـارینی بـاران بـە ویـستی خـوداو ئاوەڕۆی ڕووبارو شلەكان، لە درزی نێـوان چـیاكانو بـاران، هەنـدێ لـەم ئایەتانـە ئامـاژە بـۆ پێكهاتـەی چـیاكان دەكـات لـە بـەردە جیاوازەكـان لـە ڕەنگیـانو شـێوەیانو سـیماكەیو بنەڕەتەكـەیو بنچینەكەیو بـۆ سـیفەتەكانی تـریش، هـەروەك ئامـاژە دەكـات بـۆ ڕاستكردنەوەی لەسەر ڕووی زەویو شێوازی لەناوچـوونی لـە ڕۆژی دوایی.

٧ــ ئـەو ئایەتـە قورئانیانـەی ئامـاژە دەكـەن بـۆ سەرچـاوەی گەشەی هەریەك لە بەرگی گازیو ئاوی لە زەوی كە لە نـاخی زەوی خۆیـدا پەیـدا بـووە، یـاخود وەسـفی سروشـتی پـارێزەریی بەرگـە گازیەكەی دەكـات بـەو وەسـفەی ئاسمـان خـاوەنی گەڕانەوەیـە لـە توانـای پـێ هەسـتان بــە دانــەوەی زیـانی كـوژەر لــە مــاددە جیاوازەكانو ئەو وزەیەی تێیدایـە، دانـەوەی بەكـەڵكو بەسـود لـەو وێنەیەی كە لێی بەرزدەبێتەوە جارێكی تر بـۆی دەگەڕێتـەوە، یـان جەختدەكاتەوە لەسەر تـەنكیی چـینی ڕۆژ لـە نیوەگـۆی زەوی كـە بەرامبەر بە خـۆرە، یـان لەسـەر كـەمكردنی پەسـتانی هـەواییو بـە

دەگمەن بوونی گازەکان بە سیفەتێکی گشتیو دیاریکراو لەوانە: لەسەر هەناسەدان بەشێوەیەکی تایبەت لەگەڵ بەرزبوونەوە لەسەر ڕووی زەوی تاکو ئەوەندە نابات ئەو کەسەی بەرز دەبێتەوە بۆ ئاسمان بەبێ پارێزگاری تەواو دەخنکێت یان پشی تەنگ دەبێت، یان بۆ ئەو ڕاستەقینەیەی کە شەوی سەر زەوی لە سەرەتای بەدیهێنانی ڕووناك دەبێتەوە بە شێوەیەك نزیك دەبێتەوە لە ڕووناکی بەرەبەیانیو دوایی ڕووناکیەکەی نامێنێت، یان ئاماژە دەکات بۆ خێرایی خولانەوەی زەوی بە دەوری تەوەرەکەیدا لە بەردەم خۆرداو خێرایی بە دوای یەکداهاتنی شەوو ڕۆژ لە سەرەتای دروستبوونی زەوی.

٨ـ ئەو ئایەتانەی ئاماژە دەکەن بۆ تەنکیی بەرگی بەردینی زەویو تەختکردنی ڕووەکەیو ئامادەکردنی، سەرەڕای بەرزیو نزمیە ناسراوەکانیو درزی نێوان چیاکانو باران تێیدا، ڕووبارو جۆگەلەکانو تەختیی دەشتاییەکانو دروستبوونی نزماییەکان، یان ئاماژە دەکات بۆ ڕاستیی کەمکردنی زەوی لە لێوارەکان یان لایەکانی.










وێنەیەك درێژبوونەوەی توێکڵی زەوی بۆ کیشوەرەکان ڕووندەکاتەوە لەناو بەرگی بەردینی زەوی، بەوەی هەموو بەرزاییەك لەسەر ئاستی ڕووی دەریا درێژبووەتەوە بۆ ناو بەرگی بەردین بە ١٠ تا ١٥ ئەوەندەی بەرزاییەکەی، هەر کاتێك بەرزایی زیادی کرد درێژبوونەوەی بەشی نقوم بوو بۆ ناو زەوی چەند جارە دەبێتەوە.










وێنەیەك درێژبوونەوەی توێكڵی زەوی بۆ كیشوەرەكان ڕووندەكاتەوە لەناو بەرگی بەردینی زەوی، بەوەی هەموو بەرزاییەك لەسەر ئاستی ڕووی دەریا درێژبووەتەوە بۆ ناو بەرگی بەردین بە ١٠ تا ١٥ ئەوەندەی بەرزاییەكەی، هەر كاتێك بەرزایی زیادی كرد درێژبوونەوەی بەشی نقوم بوو بۆ ناو زەوی چەند جارە دەبێتەوە.

٩ـ ئەو ئایەتانەی ئاماژە دەكەن بە جێگیربوونی ئاوی باران لە زەویدا دوای دابەزینی بە ڕێژەی زانراو لە هەورەكان بە تواناو ویستی خوای بەرزو بالاّو بە گوێرەی زانستو ویستی خۆی، خولی ئاو بەدەوری زەویدا دەسەلمێنێت، لەناو بەردەكانیو لەوەی ئاماژە دەكات بۆ ئەوەی خوای بەرزو بالاّ هەموو شتێكی زیندووی لە ئاو دروست كردووە، یان ڕەنگدانەوە لە توانای پۆلێنكردنی بوونەوەرانی زیندوو هەروەك چۆن هۆزو دەستەو جۆرو خێزانو ڕەگەزەكانی مرۆڤ پۆلێن دەكرێن.

١٠ــ ئەو ئایەتە قورئانیە پیرۆزانەی جەخت لەسەر ئەوە دەكەنەوە كە كرداری بەدیهێنان بە چەند قۆناغێكی یەك بەدوای یەكدا تەواو بووەو بە تێپەڕبوونی ماوەیەكی كاتیی درێژ، سەرەڕای ئەوەی خوای گەورە تواناداره لەسەر هەر شتێك پێی بڵێت ببە دەبێت (كن فیكون).

١١ـ ئەو ئایەتانەی ئاماژە دەكەن بۆ كۆتایی هەریەك لە زەویو ئاسمانو ئەوەی تێیاندایە (واتا لەناوچوونی گەردوون هەمووی) بە كردارێكی پێچەوانەیی لە كرداری بەدیهێنانی یەكەم (كرداری چوونەوەیەكی بەهێز (بچووككردنەوەی گەردوون) لە بەرامبەر كرداری تەقینەوە گەورەكە) یان چوونەوەیەكی هەموو زەویو ئاسمانەكان (رتق الفتق) بەرامبەر بە تەقینەوەو لێك جیابوونەوەیان (فتق الرتق) دوایی بەدیهێنانی زەویەك جگە لەم زەویەو ئاسمان گەلێك جگە لەم ئاسمانانە.

لێواری ناوەڕاستی زەریا
ئەفریقیا
ئەمریکای باشوور
شەقبوون
لێک دوورکەوتنەوەی پلێتەکان
چوونەیەکی چینەکان
کەوڵی سەرەوە
زەریای چین
کەوڵی زەوی
ناوکی دەرەکی
ناوکی ناوەوە

وێنەیەك چینەكانی گۆی زەوی و تەنكیی بەرگە بەردینەكەی دەردەخات و جووڵەی پلێتە بەردینەكانی پێكهاتووی بنكی زەریاكان ڕوون دەكاتەوە لە دووركەوتنەوەیان لە یەكتری بۆ هێنانەدی دیاردەی فراوانبوونی بنكی دەریاو زەریاكان و نوێبوونەوەی مادەكانی بەبەردەوامی.




وێنەیەك چینەكانی گۆی زەوی و تەنكیی بەرگە بەردینەكەی دەردەخات و جووڵەی پلێتە بەردینەكانی پێكهاتووی بنكی زەریاكان ڕوون دەكاتەوە لە دووركەوتنەوەیان لە یەكتری بۆ هێنانەدی دیاردەی فراوانبوونی بنكی دەریاو زەریاكان و نوێبوونەوەی مادەكانی بەبەردەوامی.

١٢ـ ئەو ئایەتانەی ئاماژە دەکەن بۆ ڕێژەیی هەموو شتێك لە زانستی مرۆڤدا جگە لەو ڕاستییەی خوای بەرزو پیرۆز دایبەزاندووە بۆ هیدایەتی بەندەکانی بۆ سەر دواینی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)و بەڵێندان بە پاراستنی بە هەمان زمانی وەحی (زمانی عەرەبی) جا بۆمانی پاراست لە پەڕاوە ڕاستییەکەی کە ناودەبرێت بە قورئانی پیرۆزو لە سوونەتی دوایین پێغەمبەرانی‌و نێردراوانی (علیهم الصلاة والسلام).

ئەم ڕاستییە زانستیانە زانراو نەبوو بۆ مرۆڤ پێش سەدەی بیستەم، بەڵکو زۆرێك لەمانە دروست نەبووبوون بە ڕوونی لە دیدی زانایاندا تەنها لەم ساڵانەی دوایی نەبێت لەو سەدەیەدا، دوای هەوڵدانێکی بێ وچانی هەزاران زاناو شیکردنەوەی ورد بۆ بڕێکی زۆر لە تێبینییەکان‌و خوێندنەوەکان‌و تاقیکردنەوەکان‌و دەرئەنجامەکان لە شوێن‌و لایەنە جیاوازەکانی زەوی لە بەشە دەرك پێکراوەکانی ئاسمانی دونیاداو ئەوەی لە دەوروبەریدایە، سەرەڕای ئەوەش پێشەنگیی قورئانی پیرۆز بە ئاماژەکردن بۆ ئەو بڕە گەورەیە لە ڕاستییەکان بە شێوازێکی لە ڕادەبەدەری وردی زانستی‌و زمانەوانی لە دەربڕین‌و بە دەرە لە پەی پێ بردن‌و گشتگیرە لە بەڵگەکان بۆ جەختکردنەوە لەسەر لایەنێك لە لایەنەکانی ئیعجاز لە قورئانی پیرۆزدا کە دەناسرێت بە (ئیعجازی زانستی).



وێنەیەکی دەزگای ناسا، ڕۆژ وەك ئەستێرەیەکی تیشكدەر لە ناوەڕاستی ئەم گەردوونە تاریك و ڕەشەدا نیشان دەدات و جەخت لەسەر تەنکیی چینی ڕۆژ دەکاتەوە لەسەر ئەو نیوەیەی کە بەرامبەر خۆرە.



وێنەیەكی دەزگای ناسا، ڕۆژ وەك ئەستێرەیەكی تیشكدەر لە ناوەڕاستی ئەم گەردوونە تاریك و ڕەشەدا نیشان دەدات و جەخت لەسەر تەنكیی چینی ڕۆژ دەكاتەوە لەسەر ئەو نیوەیەی كە بەرامبەر خۆرە.

لەگەڵ ملکەچ بوونمان بەوەی قورئانی پیرۆز دەرئاسایە لە هەموو باسێك لە باسەکانی، لەگەڵ ئەوەشدا ئیعجازی زانستی وتارێکە بۆ خەڵکی ئەم سەردەمەمان، سەردەمی ئەو زانستو تەکنیککاریەی تێیدا دەژین، کە تیایدا خەڵکانێك بە زانستو دەستکەوتەکانی فریوخواردووبوون بە ئەندازەیەکی زۆر، لە کاتێك وەحی ئاسمانیی تێدا نەماوە تەنها قورئانی پیرۆز نەبێت، بە پارێزراوی ماوەتەوە بە هەمان زمانی وەحی بۆ ماوەی چواردە سەدەو زیاتریش، خوای گەورە وشە بە وشەو پیت بە پیت پاراستوویەتی تاکو هەموو زەوی‌و ئەوەی لەسەریەتی دەگەڕێتەوە لای خۆی، لە کاتێکدا هەموو پەڕاوە ئاسمانیە دابەزیوەکانی پێش خۆی تووشی لەناوچوونی تەواو یان وەرگێڕانیان بۆ زمانی تر بوون جگە لە زمانی وەحی لەگەڵ لە دەستدانی ئەو بنچینانەی لێی وەرگێڕدراوە، لە ماوەی ئەو گواستنەوەیەدا ڕووبەڕووی پیتگۆڕین‌و ساختەکردن‌و زیادو کەم کردنێکی زۆر گەورە بوونەتەوە، ئەوەش دەریکردووە لە چوارچێوە پەروەردگارێتییەکەی‌و دەسەوسانی کردووە لەسەر هیدایەتدانی مرۆڤایەتی، لەگەڵ بڕوای تەواومان بەوەی ئەو بنچینەیەی لێی ونکراوەو لابراوە لەو بەشە وەحییە ئاسمانییەیە کە قورئانی پیرۆز داوامان لێدەکات ملکەچ بین بە

ناوەڕۆكـە ڕاسـتەكەی پـێش ئـەوەی ڕووبـەڕووی ئـەو پیتگۆڕینـە ببێتەوە كە ڕووبەڕووی بووەتەوەو ئێستاش ڕووبـەڕووی دەبێتـەوە، جا لێرەدا گـەورەیی ئـەم پەیامـە كۆتاییـەی قورئـانی پیرۆزمـان بـۆ دەردەكەوێت كە پـەروەردگاری بـەرزو پیرۆزمـان بـەڵێنی پاراسـتنی داوەو پاراستیشی لە هیدایەتی مرۆڤایەتی بۆ ئایینە ڕاستەكەی خوا لـە كاتێكـدا مرۆڤایـەتی پێویـستی بـە بـوونی ئـەو هیدایەتـە پەروەردگارییە هەیە.

# هەندێ ئایەتی قورئانیی دەربارەی زەویناسی

لە كاتێكدا ناكرێت مناقەشەو گفتوگۆی بەڵگە زانستییەكان بكەین لە سەدو دە (١١٠) ئایەتی قورئانی پیرۆز كە ئامـاژە دەكـات بۆ هەندێك لە بنەمای بنچینەیی بۆ زانستەكانی زەوی لـە وتەیەكدا تـەنها سێ باسی گرینگم لـەم بـوارەدا هەڵبـژاردووەو پـشتم پێی بەسـتووە لـە هێنانـەوەی بەڵگـەی زانـستیی گونجـاوی سـنووردار لەسەر ئەوەی ناكرێت قورئانی پیرۆز دەستكردی مـرۆڤ بێت بـەڵكو وتەی خـوای بەدیهێنـەرەو ئـەم باسانەش بـەم خاڵانـەی داهـاتوودا دەخەمەڕوو:

## یەكەم: بەدیهێنانی ئاسمانەكانو زەویو لەناوچوونیان

خوای بەرزو پیرۆز لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرمووێت:

﴿أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَاهُمَا وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ (٣٠)﴾ (سورەتی الانبیاء: ٣٠).

واتا: ئایا ئەوانـەی بێبـاوەڕ بـوون نـەیان بینیـووەو بۆیـان ڕوون نەبۆتەوە بەڕاستی ئاسمانەكانو زەوی یەك پارچـە بـوون لـەوەودوا لێكمان جیاكردنـەوە ( ئەمـە ئاماژەیـە بـۆ ئـەوەی ئـەم ڕاسـتەقینە

زانستیە لە لایەن ئەوانەوە پەی پێ دەبرێت)، لە ئاویش هەموو شتێكی زیندوومان فەراهەم هێناوە، ئایا ئەوانە هەر باوەڕ ناهێنن (بەو ڕاستیانەو بەو دەسەڵاتە بێ سنوورەی ئێمە)؟!

پەسندترینی بیردۆزە پێشنیاركراوەكان بۆ لێكدانەوەی گەشەی گەردوون لەلایەن زانایانی ئەمڕۆ بریتییە لە (بیردۆزی تەقینەوە گەورەكە)و ئەمەش بە سوود وەرگرتنی لە گەورەترین توانای بەڵگە هەستیەكان لەوەش فراوانبوونی گەردوونو بوونی پلەی گەرمی جێگیر لە لایەكانی بەشی هەستپێكراوی گەردوونو وێنەگرتنی پاشماوەی دوكەڵی بەرهەمهاتوو لە كرداری تەقینەوە گەورەكە لە لایەكانی ئەو بەشە هەستپێكراوەی گەردوون.

ڕاستیەتی فراوانبوونی گەردوون زوو قورئانی پیرۆز ئاماژەی بۆ كردووە، ئەمەش بە وتەی ڕاستی خوای بەرزو پیرۆز لە قورئانی پیرۆزدا هەروەك دەفەرموویت:

﴿وَٱلسَّمَآءَ بَنَيۡنَٰهَا بِأَيۡيْدٖ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ ﴿٤٧﴾﴾ (سورەتی (الذاريات): ٤٧).

واتا: ئێمە ئاسمانمان بە دەستی توانایی خۆمان دروستكرد، بەردەوامیش گەورەی دەكەینو فراوانی دەكەین.




وێنەیەک جوولەی فراوانبوونی بنکی زەریاکان لە ماوەی سالاندا ڕوون دەکاتەوە، بە کاری جولان و بەستانی چینەکانی توێکلی زەوی کە لێی پێکهاتووە.



كليكى تمەن چينەكان زەوى

| | |
|---|---|
| ٠-٢مليون سال | ٥٨-٦٦مليون سال |
| ٢-٥مليون سال | ٦٦-٨٤مليون سال |
| ٥-٢٤مليون سال | ٨٤-١١٧مليون سال |
| ٢٤-٣٧مليون سال | ١١٧-١٤٤مليون سال |
| ٣٧-٥٨مليون سال | ١٤٤-٢٠٨مليون سال |

وێنەیەك جووڵەی فراوانبوونی بنكی زەریاكان لە ماوەی ساڵاندا ڕوون دەكاتەوە، بە كاری جوڵان و بەستانی چینەكانی توێكڵی زەوی كە لێی پێكهاتووە.

ئەم ئایەتە قورئانیە پیرۆزە گوێی خەڵكی ڕووشاند لە ماوەی چواردە سەدەو خەڵكی تا نیوەی یەكەمی سەدەی بیستەم لەسەر ئەوە بوون گەردوون جێگیرەو ناگۆڕێت كاتێك زانایانی گەردووناسی لە سەرەتای بیستەكانی سەدەی بیستەم (١٩٢٤) دانیان نا بە ڕاستییەتی فراوانبوونی گەردوونو دووركەوتنەوەی زۆربەی كاكێشانەكان لە ئێمەو لە یەكتری بە خێراییەك نزیكەی خێرایی ڕووناكی دەبێت (خەمڵێنراوە بە نزیكەی سێ سەد هەزار كیلۆمەتر لە یەك چركەدا)، ئەم تێبینیانەش بە لێڵی لە نێوان زانایان مایەوە تاكو یاساكانی فیزیای تیۆری دانراو هەموو هاوكێشە بیركاریەكانو پێوانە گەردوونیەكان ڕاستی كشانی گەردوونو فراوانبوونو دووركەوتنەوەی كاكێشانەكان، یەكێك بووە لە گرینگترین دۆزینەوە زانستییەكانی مێژووی مرۆڤایەتیو هەر زوو قورئانی پیرۆز ئاماژەی بەوە كردووە بەر لە گەیشتنی زانستی مرۆڤ بە زانینیان بە زیاتر لە (١٣) سەدەو بەوە ئایەتی (٤٧)ی سورەتی ( الذاريات) وەك یەكێك لە گرینگترین ئایەتەكانی ئیعجازی زانستی لە قورئانی پیرۆزدا ماوەتەوەو یەكێكە لە بەڵگە نەویستەكان بەوەی ناكرێت قورئانی پیرۆز دەستكردی مرۆڤ بێت بەڵكو وتەی خوای بەدیهێنەرە.

بە دەستپێکردن لە ڕاستیەتی فراوانبوونی گەردوونەوە هەموو زانایانی گەردوونو فیزیای گەردوونی بانگەشەیان بۆ تێڕوانینێکی لۆژیکی کرد کە ئەوە دەگەیەنێت ئەگەر ئێمە ئەم فراوانبوونەی گەردوون بۆ دواوە بگەڕێنینەوە بەرەو دواوە لەگەڵ کاتدا ئەوا هەر دەبێت هەموو وێنەی ماددەو ئەو وزەیەی هەیە لە گەردوون بەیەك بگەن، هەروەك چۆن هەریەك لە کاتو شوێن بەیەك دەگەن، جا ئەوانەی بوونیان هەیە هەموویان لەگەڵ یەکتردا کۆدەکرێنەوە لە تەنێکی سەرەتایی بێ پایان لە بچووکیی قەبارەیدا تا دەگاتە شێوەی (نەبوون)و بێ پایان لە چڕیە زۆرەکەی تا پلەیەك هەموو یاسا فیزیاییو بیرکاریەکان تێیدا ڕادەوەستێت، ئەو تەنۆچکەیە سیفەتەکەی قۆناغی چوونەوەیەك (مرحلە الرتق)ە کە دەتەقێتەوە لە دیاردەیەك زانایان ناوی دەبەن بە (کرداری تەقینەوە گەورەکە)و قورئان ناوی دەبات بە (کرداری "الفتق" واتا کرداری پەرشو بڵاوبوونەوەو لێك جیابوونەوە)و ئەوەش وتەی خوای بەرزو پیرۆزە کە دەفەرمووێت:

﴿أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّ السَّمَٰوَٰتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَٰهُمَا ۖ وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَآءِ كُلَّ شَىْءٍ حَىٍّ ۖ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٠﴾﴾ (سورەتی (الانبیاء): ٣٠).

واتــا: ئایــا ئەوانــەی بێبــاوەڕبوون نــەیانبینیووەو بۆیــان ڕوون نەبۆتەوە بەڕاستی ئاسمانەكانو زەوی یەك پارچـە بـوون لـەوەودوا لێكمان جیاكردنەوە، لە ئاویش هەموو شتێكی زینـدوومان فەراهـەم هێناوە، ئایا ئەوانە هەر باوەڕ ناهێنن (بەو ڕاستیانەو بەو دەسەڵاتە بێ سنوورەی ئێمە)؟!

هــەروەها كــرداری تەقینــەوە گەورەكــە لــە ســنووری زانــستی دەستكەوتوو وەك یـەكێك لـە بـیردۆزە لێكـدەرەوەكان بـۆ گەشـەی گەردوون ماوەتەوە، زانا ناتوانێت ڕێزی زانستەكەی بگرێـت ئەگـەر بڕیار بـدات بـە ڕوودانـی، چـونكە كـرداری بـەدیهێنان بـە هـەر سـێ ڕەهەندەكەیــەوە: (بــەدیهێنانی گــەردوون، ژیــان، مــرۆڤ)یـش لـەو ڕووداوە پەنهانیانە كە هیچێك لـە بـەدیهێنراوەكانی نـەیانبینیوە لـەو بارەیەوە پەروەردگارمان لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموویێت:

﴿مَّآ أَشۡهَدتُّهُمۡ خَلۡقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلَا خَلۡقَ أَنفُسِهِمۡ وَمَا كُنتُ مُتَّخِذَ ٱلۡمُضِلِّينَ عَضُدٗا ٥١﴾ (سوڕەتی (الكهف): ٥١).

واتا: وەنەبێت من لـە كـاتی دروسـتكردنی ئاسمانـەكانو زەویـدا ئــەوانم ئامــادە كردبێــت، بگــرە هــەتا لــە دروســتبوونی خۆشــیان ئاگادارنین، بـە ڕاسـتی مـن هـەرگیز ئەوانـەی خـەڵك گـومڕا دەكـەن نەمكردوون بە یارمەتیدەری خۆمو پشتم پێ نەبەستوون.




وێنەیەك زنجیرەچیاكان لە لێواری كیشوەرەكان نیشان دەدات، ئەوەش بە كرداری بەریەككەوتنی بنكی زەریاكان بە كیشوەرەكان دروست دەبێت لەگەڵ ساڵاندا.

وێنەیەك زنجیرەچیاكان لە لێواری كیشوەرەكان نیشان دەدات، ئەوەش بە كرداری بەریەككەوتنی بنكی زەریاكان بە كیشوەرەكان دروست دەبێت لەگەڵ ساڵاندا.

ئەو قورئانە پیرۆزەی بڕیاری ئەو ڕاستییە دەدات هەر ئەوەشە لە زۆربەی ئایەتەكان داوامان لێ دەكات بە بیركردنەوە لە بەدیهێنانی ئاسمانەكان‌و زەوی‌و وەرگرتنی پەند لەو كردارە دەرئاسایە ڕەهاو بێ پایانانە كە توانای خوای بەدیهێنەرە، لەوانەش ئەوەیە كە دەفەرمووێت:

﴿قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانْظُرُوا كَيْفَ بَدَأَ الْخَلْقَ ثُمَّ اللَّهُ يُنْشِئُ النَّشْأَةَ الْآخِرَةَ إِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٠﴾﴾ (سورەتی (العنكبوت): ٢٠).

واتا: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) پێیان بڵێ: با بگەڕێن بە زەویدا، تەماشا بكەن‌و سەرنج بدەن چۆن ئەو زاتە دروستكراوانی بەدیهێناوە، لەوەودواش هەر خوا سەرلەنوێ بەرپایان دەكاتەوە (بە شێوەو شێوازێكی تر ئاسمانەكان‌و زەوی‌و ئێمەش دەهێنێتەوە كایە) بە ڕاستی خوا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێكدا هەیە.

لێكدانەوەی نێوان ئەو ئایەتە قورئانیانەی ئاماژەدەكات بۆ ئەوەی سەرەڕای هەبوونی كرداری بەدیهێنان بە هەرسێ ڕەهەندەكەی (بەدیهێنانی گەردوون، ژیان، مرۆڤ) بریتییە لە كردارێكی پەنهان‌و ناكەوێتە ژێر بیستن‌و بینینی مرۆڤەوە جگە لەوەی خوای گەورە بۆمانی هێشتووەتەوە لە بەردەكانی زەوی‌و لە

پەڕپەڕەی ئاسمان لەو شتە هەستپێکراوانەی یارمەتی مرۆڤ دەدات لە گەیشتن بە بۆچوونێکی ڕاست لەسەر چۆنیەتی بەدیهێنان لە کاتێکدا بڕوای بە خوای گەورەو بەدیهێنەر هەیە، ئەگەر بڕوای نەبێت کەوتووەتە گێژاوو خەیاڵاتێکەوە ئەگەر بەڵگە هەستیەکان بە دەستیەوە بووایە جگە لە خۆی کەس نەدەبووە خاوەنی.

لەبەر ئەوە ئێمەی کۆمەڵی موسوڵمانان بە ڕاستی باوەڕمان هەیە بە (کرداری تەقینەوە گەورەکەی گەردوون)و بەو بیردۆزە دەگەینە پلەی ڕاستی تەنها بە بوونی ئاماژەیەك بۆی لە قورئانی پیرۆزدا، ئەگەرچی زانستی دەستکەوتووی مرۆڤ هەرگیز ناتوانێت قسە لەسەر ئەوە بکات سەرەڕای بەڵگەی زۆری پشتگیریکار بۆ ئەوە، لەوانە فراوانبوونی گەردوونو جێگیریی پلەی گەرمی لەسەر هەموو لایەکانی بەشی زانراوی گەردوونو وێنەگرتنی پاشماوەی خۆڵەمێشی گەردوونی لەسەر ئەو لایەنانەو پێوانەی پێشینەی تیشکدەری گەردوون لە ساڵی ١٩٨٩ز تەواو بوو، بە نزیکەی ٣ پلەی ڕێك دانرا.

لە ١٩٨٩/٩/٨ز دەزگای ئاسمانی ئەمریکی کەشتییەکی ئاسمانی بە ناوی (دۆزینەوەی پێشینەی تیشکدەری گەردوون) هەڵدا، بە

دەوری زەویدا بەرزبووەوە تا گەیشتە ٦٠٠ كم لەسەر ئاستی ڕووی دەریاوە، ئەمەش بۆ پێوانەی پلەی گەرمی پێشینەی تیشكدەری گەردوونو پێوانەی هەریەك لە چڕی مادیو ڕووناكی شەپۆلە وردەكان، بڵاوكردنەوەی ڕاپۆرتی ئەم گەشتەش لە مانگی چواری ساڵی ١٩٩٢ز بوو كە سەلماندنی ماددی دیاری تێدابوو. وێنەكە جەخت لەسەر فراوانبوونی گەردوون دەكاتەوە، هەروەها وێنەی پاشماوەو شوێنەواری ئەو دوكەڵە گیرا كە بەرهەم هاتووە لە ئەنجامی كرداری تەقینەوە گەورەكە {كرداری لێك جیابوونەوە}، هەروەك چۆن پێشینەی تیشكدەری گەردوون خەملێنرا بە كەمتر لە سێ پلەی تەواو، وێنەی پاشماوەی ئەو دوكەڵەی یەكەم گیرا پاش دە ملیار ساڵی ڕووناكی، بریتی بوو لەباری دوكەڵی تاریك. گەردوون ڕەش بوو بەر لە بەدیهێنانی ئاسمانەكانو زەوی، قورئانی پیرۆز پێش هەموو زانیاریەكانی مرۆڤ كەوتووە بە ئاماژەكردن بۆ ئەو ڕاستییە، ئەوەش بە زیاتر لە ١٣ سەدەو نیو، لەو بارەوە دەفەرموێت:

﴿ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِىَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ٱئْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَآ أَتَيْنَا طَآئِعِينَ ﴿١١﴾﴾ (سورەتی (فصلت): ١١).

واتا: ئینجا خوای گەورە ویستی ئاسمان ڕێك بخاتو دروستی بکات لە کاتێکدا دوکەڵ بوو، جا بە ئاسمانو زەوی فەرموو: فەرمانبەردارو ملکەچ بن، بە خۆشی خۆتان یان بە زۆر بتانخەمە ژێر دەسەلاتی خۆمەوە؟! هەردوولا خێرا وتیان: ملکەچی تۆینو چۆن دەفەرمویت وا دەکەین.

بەو شێوەیە قورئانی پیرۆز پێشەنگی هەموو زانیاریە مرۆڤایەتیەکانە بە ئاماژەکردن بۆ چۆنیەتی بەدیهێنانی ئاسمانەکانو زەویو ئەوەش بە زیاتر لە ١٣ سەدەو ئاماژەکردن بۆ ژمارەیەك لە ڕاستییەکانی ئەم زانستە لە دیارترینیان تەقینەوە گەورەکەیە یان کرداری لێکجیاکردنەوەی زەویو ئاسمانەکان {فتق الرتق} و گۆڕانی ئەو تەنە بچووکە یەکەمییە بۆ دوکەڵو بەدیهێنانی هەریەك لە ئاسمانەکانو زەوی لەو دوکەڵەو فراوانبوونی گەردوون دوای ئەوە، واتا دوای دەستپێکردنی گەردوون بە گرتنەبەری کرداری فراوانبوون تا کۆتایی کە کەس نایزانێت جگە لە خودا.

زانایانی گەردووناسی جیاوازن لە نێوان خۆیاندا لە بارەی کرداری فراوانبوونی گەردوون بە جیاوازیەکی زۆر، هەیانە بانگەشەی ئەوە دەکات گەردوونمان گەردوونێکی کراوەیە، بە واتای

دەگاتە دووریەكی بیٚ كۆتایی، ئەوانی تر بانگەشەی ئەوە دەكەن گەردوونمان گەردوونێكی داخراوە، بە واتای هێزی پاڵنانی وندەكات بۆ دەرەوە بە بەردەوامی تاكو كرداری فراوانبوون ڕادەوەستێت، ئەو كاتە هێزی كێشكردن دەستپێدەكات لە كۆكردنەوەی لایەكانی گەردوون لە كردارێكی پێچەوانەی كرداری تەقینەوەی گەردوون و كشانی كە زانایان پێی دەڵێن {كرداری چوونەوەیەكە بەهێزەكە} یان {كرداری چونەوەیەكی لێك جیابوونەوەی زەوی و ئاسمانەكان (رتق الفتق)} ئەمەش هەڵدەستێت بە گێڕانەوەی گەردوون بۆ بارە تەنۆچكە سەرەتاییەكەی یەكەمی، كە بەدیهێنان لێیەوە دەستیپێكرد، ئێمەی كۆمەڵی موسوڵمان پاڵپشتی لەم بیردۆزە دەكەین و بەرزی دەكەینەوە بۆ پایەی ڕاستی و ئەوەش لەبنچینەدا لە وتەی ڕاستی خوای مەزنە كە دەفەرمووێت:

﴿يَوْمَ نَطْوِي ٱلسَّمَآءَ كَطَيِّ ٱلسِّجِلِّ لِلْكُتُبِ ۚ كَمَا بَدَأْنَآ أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُۥ ۚ وَعْدًا عَلَيْنَآ ۚ إِنَّا كُنَّا فَٰعِلِينَ ﴿١٠٤﴾﴾ (سورەتی (الانبياء): ١٠٤).

واتا: ڕۆژێك دێت ئێمە ئاسمان دەپێچینەوە، وەكو چۆن پەرتوكی كراوە دادەخرێت و دەپێچرێتەوە هەروەك چۆن لە سەرەتاوە دروستمان كرد، وەك ئەوسای خۆی لیٚ دەكەینەوە (بۆ

ئەوەی سەر لە نوێ بەشێوەیەکی تر دروستی بکەینەوە) جا ئەوە بەڵێنو پەیمانی ئێمەیە، بێگومان ئێمە ئەو کارە ئەنجام دەدەین.

سەیری وتەی ڕاستی خواو قەشەنگی لێکدانەوەی قورئان بکە کە دەفەرموێت:

﴿.........كَمَا بَدَأْنَا أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُ.........﴾

بە واتای ئەم گەردوونە دوورە بەرفراوانە، ئەم بینایە پتەوە، بیناکراوە لە تریلیۆنەها تریلیۆن لە ئەستێرەکان کۆتایی دێت بە کرداری پێچەوانە بۆ خاڵی یەکەم کە هەموو وێنەیەکی ماددەو شوێنو کاتی تێ دەبینرێتو بەوە بە تەواوی لەو ئەستێرە سەرەتاییە دەچێت کە گەردوون پێی دەستی پێکرد (قۆناغی چونەوەیەك).

بەڕاستی سەرسوڕهێنەرە ئایەتی بەدیهێنانی یەکەمجار بە (فتق الرتق) هاتووە، ئایەتە پێچەوانەکە (رتق الفتق) هەردووکیان لەیەك سوڕەتدا هاتووە، ئەویش سوڕەتی (الانبیاء) (هەردوو ئایەتی ٣٠، ١٠٤).



پشتێنەی لاوازی زەوی




پاڵنانی بەرزبوونەوە
بەرگی کیشوەری




خەندەقی شکاوی




دەریای تەنگەبەر




لێواری ناوەڕاستی زەریا
خەندەق
بەرگی کیشوەری

لێرەدا زانستی بەدەستکەوتوو سەرسام وەستاوە، زانایانی گەردوون‌و فیزیای گەردوونی لەوانەی بانگەشەی کرداری چوونەوەیەکە بەهێزەکە دەکەن جیاوازن لە بۆچووندا، هەیانە وای بۆ دەچێت کۆتایی هەبوونەو هیچی لە دوا نایەت، هەیانە وای بۆ دەچێت کردارێکی بە لەرەلەری بەردەوامە واتا: تەقینەوە، دوایی چوونەوەیەك، دوایی تەقینەوە، دوایی چوونەوەیەك بە بێ وەستان، هەموو ئەمانە بەشێوەی گومان هێنراونەتەوە لە قولایی غەیبی ڕەهاداو نایوروژێنێت تەنها بە وتەی ڕاستەقینەی پەروەردگار نەبێت کە دەفەرموێت:

﴿ يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ ۖ وَبَرَزُوا۟ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴿٤٨﴾ ﴾

(سورەتی (ابراهیم): ٤٨).

واتا: لە ڕۆژێکدا ئەم زەویە دەگۆڕێت بۆ زەویەکی ترو هەروەها ئاسمانەکانیش دەگۆڕێن بەشێوەو شێوازێکی ترو هەموو ئەو خەڵکە دەردەکەون‌و ئامادەن لە بەردەم دادگای خوای تاك‌و تەنهاو بە دەسەڵات‌و خەشمگیر لە کافران.




وێنەیەك گەشەی گەردوون ڕوون دەكاتەوە هەروەك چۆن قورئانی پیرۆز باسی كردووە، ئەوەش لە ماوەی قۆناغی (الفتق)و گۆڕانی بۆ پەڵە هەورێك لە دوكەڵ، دوایی بۆ گەردوونی ئێستا كە دەستی بە فراوانبوونێكی لەسەرخۆو بە پلەپلە كردووە، تاكو كرداری پاڵنانو فراوانبوون دەگۆڕێت بە بیردۆزی (چونەوەیەكی بەهێز)، ئەمەش لە كۆتاییەكانی سەدەی بیستەمدا بە بیردۆزی سمیس ناسرابوو.



وێنەیەك گەشەی گەردوون ڕوون دەكاتەوە هەروەك چۆن قورئانی پیرۆز باسی كردووە، ئەوەش لە ماوەی قۆناغی (الفتق)و گۆڕانی بۆ پەڵە هەورێك لە دوكەڵ، دوایی بۆ گەردوونی ئێستا كە دەستی بە فراوانبوونێكی لەسەرخۆو بە پلەپلە كردووە، تاكو كرداری پاڵنانو فراوانبوون دەگۆڕێت بە بیردۆزی (چونەوەیەكی بەهێز)، ئەمەش لە كۆتاییەكانی سەدەی بیستەمدا بە بیردۆزی سمیس ناسرابوو.

هەروەها واتای ئەمەش دوای کرداری تەقینەوە یەکەمییەکە یان (فتق الرتق) هیچ شتێك ڕوونادات تەنها پێچانەوەی گەردوون نەبێت (واتا کردارێك لە چوونەوەیەکی بەهێز) تێیدا گەردوون دەگەڕێتەوە شێوە یەکەمییەکەی: تەنۆچکەیەك بێپایان لە نەبوونی قەبارە تا دەگاتە نزیکەی نەبوون‌و بێپایان لە گەورەیی چەندێتی ماددەو وزەو ئینجا دووبارە دەتەقێتەوەو دەگۆڕێت بۆ هەورێك لە دوکەڵ، زەویەك دروست دەبێت جیاواز لەم زەویەی ئێمە، ئاسمانێك جیاواز لەوەی ئێمە، پاشان زیندووبوونەوەی بەدیهێنراوەکان‌و مانەوەیەك بێ مردن لە ژیانی دوا ڕۆژدا، یان لە بەهەشتی هەتا هەتایی یان لە ئاگردا بۆ هەمیشە هەروەك پێغەمبەر (ﷺ) پێی ڕاگەیاندووین.

لێرەدا لایەنێك لە لایەنەکانی ئیعجازی زانستیمان بۆ ڕوون دەبێتەوە، ئەوەش لایەنی پشتگیریکردنی یەکێکە لە بیردۆزەکانی زانست بۆ پایەی ڕاستی تەنها بە بوونی ئاماژەیەك بۆی لە قورئانی پیرۆزدا، بەوەش بەهۆی قورئانی پیرۆز پاڵپشتی لە زانستی گەردوونی بەدەستکەوتوو دەکەین نەك بە پێچەوانەوە، بە هەمان شێوە پاڵپشتی کردنی یەکێك لە بیردۆزەکانی زانستی دەستکەوتوو بە فەرموودەیەکی ڕاست‌و دروستی گێڕدراوە لە پێغەمبەر (ﷺ) دەبێت، بەمەش بە فەرموودەیەکی پیرۆزی پێغەمبەرەوە (ﷺ) پاڵپشتی زانستی دەستکەوتووی مرۆڤایەتی دەکەین نەك بە پێچەوانەوە، ئەوەش پەیڕەوێکی نوێیە لە مامەڵەکردن لەگەڵ

ئاماژە گەردوونییەكان لە قورئانی پیرۆزو لە فەرموودەی پێغەمبەری مەزن كە بڕوا ناكەم كەس پێش من بۆ ئەو شتە چووبێت.

لەم خستنەڕووەدا بەڕوونی بۆمان دەردەكەوێت كرداری بەدیهێنانی ئاسمانەكانو زەویو داهاتووی لەناوچوونیانو دووبارە دروستبوونەوەیان ناكرێ دوور لە قورئانی پیرۆزو سوونەتی پێغەمبەری پاكو بێگەرد یەكلایی بكرێتەوە، سەرەڕای ئەوەی خوای مەزن لە پەڕپەڕەی ئاسمانو بەردەكانی زەوی بۆی جێ هێشتووین لە بەڵگە هەستیەكان ناكرێ مرۆڤ بگاتە تێگەیشتنی ئەوە، چونكە زانستی مرۆڤایەتی بەدەستكەوتوو بۆی نیە (ناكرێ) پێ بنێتە قۆناغی بیردۆز دانانەوە (بە واتای دانانی بیردۆزێك لە بیردۆزەكان) لە بارەی مەسەلەی بەدیهێنان بە هەرسێ ڕەهەندەكەیەوە: (بەدیهێنانی گەردوون، ژیان، مرۆڤ)، بیردۆزی زۆر دانرا لە بواری كرداری بەدیهێنان بە تایبەت سەرەڕای زۆری پێشینەی ئەو كەسانەی دایاننـاونو زۆری دیدارەكانیان، ڕووناكیو نوورێك بۆ موسوڵمان (تەنها موسوڵمان) لە خوای بەرزو پیرۆز دەمێنێتەوە لە ئایەتی قورئانی پیرۆز یان فەرموودەی ڕاستی پێغەمبەر (ﷺ) بەرزكراوە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) دەكرێت یارمەتی بدات بۆ ئەوەی بە یەكێك لەم بیردۆزانە بۆ پایەی ڕاستی هەنگاو بنێت تەنها بۆ دەستكەوتنی ئاماژەیەك بۆی لە قورئانی پیرۆزدا یان

لە فەرموودەكانی كۆتایی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)، خـوا لەو كەسانەش خۆش بێت كـە دوایـان دەكـەون بـە چـاكە تـا ڕۆژی دوایی.

## دووەم:ـ دابەزینی ئاسنی زەوی لە ئاسمان:

پەروەردگاری پیرۆزو بەرزمان لە قورئاندا دەفەرمووێت:

﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ وَأَنزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ اللَّهُ مَن يَنصُرُهُ وَرُسُلَهُ بِالْغَيْبِ إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ ﴿٢٥﴾﴾ (سورەتی (الحدید): ٢٥).

واتـــا: ســـوێند بـــە خـــوا بێگومـــان ئێمـــە پێغەمبـــەرەكانمان ڕەوانـەكردووە هـاوڕێ لەگـەڵ بەڵگـەو نیـشانەو مـوعجیزەی ڕوونو ئاشكراداو كتێبە ئاسمانیەكانیشمان هێنایە خوارەوە كە لەگەڵ ئـەو پێغەمبەرانەدا بێت، تەرازوو و پێـوەری شـەرعیو دادپەروەرانـەمان بۆ ڕوون كردوونەتەوە تا خەڵكی بە عەدالەتو دادپەروەریی ڕەفتـار بكـەن، هـەروەها ئاسنیـشمان هێناوەتـە خـوارەوە كـە ماددەیـەكی سەختو ڕەقەو سوودبەخشیشە بۆ خەڵكی، تا ئەوەی خوا دەیزانێ لە جیهانی واقعیشدا دەربكەوێت كە كـێ پـشتگیرو لایـەنگری خـواو پێغەمبەرەكانیەتی لـە كاتێكـدا كـە ئـەو زاتـە پەنهانـە، چـونكە بـە ڕاستی خوا بەهێزو باڵادەستە.









وێنەیەك گەرمی گڕكانی لە بنكی زەریاكان نیشان دەدات، ئەمەش ئەوەیە كە قورئانی پیرۆز بە دەریای داگیرساو وەسفی دەكات، ئەوەی كە لێكۆڵینەوە زانستییەكان لە سەدەی بیستەمدا سەلماندیان،ئەوەیە كە دەریایەكە گڕی تێبەردەبێت تا بنكەكەی گەرم دادێتو دادەگیرسێت.








وێنەیەك گەرمی گڕكانی لە بنكی زەریاكان نیشان دەدات، ئەمەش ئەوەیە كە قورئانی پیرۆز بە دەریای داگیرساو وەسفی دەكات، ئەوەی كە لێكۆڵینەوە زانستییەكان لە سەدەی بیستەمدا سەلماندیان،ئەوەیە كە دەریایەكە گڕی تێبەردەبێت تا بنكەكەی گەرم دادێتو دادەگیرسێت.

هەروەها ئەم ئایەتە پیرۆزە دابەزینی ئاسن لە ئاسمان بۆ زەوی بەوە دەچوێنێت کە دابەزینی وەحییە بۆیو جەختدەکاتەوە لە توانای ئاسن کە زۆر بەهێزەو سودی بۆ خەڵکی هەیە.

ئێمە ئەمڕۆ دەزانین کە توخمی ئاسن بریتییە لە توخمە زۆر بڵاوەکان لە هەسارەی زەوی، بە گشتی ئاسن بە تەنها زیاتر لە ٣٥٪ی کۆی گشتی بارستایی زەوی پێك دەهێنێت کە دەخەملێنرێت بە نزیکەی شەش هەزار ملیۆن ملیۆن تەن (٥٩٧٤ X ١٠^١٨ تەن)و بریتییە لە چوارەمین توخمی بڵاو لە توێکڵی زەوی کە ڕێژەکەی دەگاتە ٥,٦٪ ، ئەم دابەشبوونە واتای زۆرینەی ئاسنی زەوی چڕبووەتەوە لە کرۆکی زەویو کەوڵی زەوی (mantle)و ئەمەش بە تەواویو بە کردار سەلمێندرا کە زەوی کرۆك (core)ێکی ڕەقی ناوەکی هەیە کە ڕێژەی ئاسن تێیدا دەگاتە ٩٠٪ و ڕێژەی نیکل بۆ نزیکەی ٩٪ (ئەمەش لە کۆمەڵەی توخمەکانی ئاسنە) سەرەڕای نزیکەی ١٪ی توخمە سوکەکان وەك کبریتو فسفۆرو سلیکۆن، دوای ئەم کرۆکە ڕەقە بۆ دەرەوەی کرۆکی شل دێت کە هەمان پێکهاتەی کیمیایی هەیە، دوایی چوار کەوڵی جیاکراوە کە ڕێژەی ئاسن تێیدا لە ناوەوە بۆ دەرەوە

كەمدەكات بە پلەپلە (یەك بە دوای یەك) تـا دەگاتـە تـوێكڵی زەوی كە ٥,٦٪ ئاسنی تێدایە.

لێرەدا پرسیارێكی گرنگ بە دەردەكەوێت: چۆن ئاسنی زەوی لە ئاسمان بۆی دابەزیوە؟ چۆن بەرگە بەردینەكـەی بڕیـوە؟ چـۆن لـە نـاخی زەویـدا چـڕبووەتەوە؟ چـۆن ڕێژەكـەی بـەو شـێوە ڕێكـە كەمدەكات لە چەقی زەوی تا دەگاتە سەر ڕووەكەی؟

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە هەر دەبێت بەو شێوەیە سەیری ئەم زەویە بكەین كە بەشێكە لەم گەردوونەی دەوری داوە، ئـەوەی لەم لێكۆڵینەوانەی دوایی سەلمێنراوە زۆربـەی زۆری پێكهـاتووە لـە گـازی هایـدرۆجین كـە زیـاتر لـە ٧٤٪ مـاددەی گـەردوونی بینـراو پێكـدەهێنێت، هایـدرۆجینیش سـووكترینی توخمـە ناسـراوەكانەو كەمترینیانە لە دروستبووندا، دوای هادرۆجین بـۆ فرەیـی لـە بەشـی دەركپێكراوی گەردوون گازی هیلیۆمە كـە نزیكـەی ٢٤٪ دەبێـت لـە ماددەی گەردوونی بینراوو ١٠٨ توخمەكـەی تـریش كـە دەمێننـەوە ئەوانــەی مـرۆڤ تــا ئێـستا ناسـیونی كـەمترە لــە ٢٪ لــە مــاددە دۆزراوەكان.



وێنەی هێڵەکانی درێژیو پانی گۆی زەوی، ناوکی ناوەوەی لەسەر شێوەی گۆ نیشان دەداتو پێکدێت بە نزیکەیی ٩٠٪ لە ماددەی ئاسنی کە لە ئاسمانەوە بۆی دابەزیوەو تەنکیی بەرگی بەردینی زەوی دەردەخات.



وێنەی هێڵەکانی درێژیو پانی گۆی زەوی، ناوکی ناوەوەی لەسەر شێوەی گۆ نیشان دەداتو پێکدێت بە نزیکەیی ٩٠٪ لە ماددەی ئاسنی کە لە ئاسمانەوە بۆی دابەزیوەو تەنکیی بەرگی بەردینی زەوی دەردەخات.

ئەم تێبینیانە دەیسەلمێنێت ناوكی گەردیلەی هایدرۆجین یەكەی بنچینەییە، هەموو توخمەكانی لێ دروست بووەو لێی دروست دەبێت بە كردارێك ناو دەبرێت بە یەككگرتنی ناوكی (الاندماج النووي)، ئەم كرداری یەككگرتنی ناووكیەی گەردیلەكان هێزو وزەی ئەستێرەكان دەنوێنێت، چونكە كردارێكی ڕەهایە بۆ وزەو هەر ئەوەشە هۆی سەرەكی بۆ تیشكدانەوەی (گڕگرتنی) ئەستێرەكان.

كرداری یەككگرتنی ناوكی لە خۆردا ناگاتە بەرهەمهێنانی هیلیۆم، سەرباری ڕێژەیەكی كەم لەو توخمانەی كێشی گەردیلەییان بەرزە هەرگیز ناگاتە ئاسنو ناتوانێت بگاتە بەرهەمهێنانی هەندێك ناوكی گەردیلەكانی ئەلەمنیۆمو سلیكۆن.

بەلام خۆر ڕێژەی ئاسن تێیدا تێپەڕ ناكات لە (٠,٠٠٣٧-٪ ) هۆیەكەشی ئەو بارستە نەیزەكییە ئاسنانەیە دەكەونە سەر خۆر هەروەك چۆن دەكەونە سەر زەوی.

لێرەدا بەڵگەلی زۆر هەن لەسەر ئەوەی زەویو پاشماوەی هەسارەكانی كۆمەڵەی خۆر لە بنەڕەتدا لە خۆر جیابوونەتەوە، خۆریش هەرگیز كرداری لێكدانی ناوكی تێیدا ناگاتە بەرهەمهێنانی ئاسن، بەڵكو پێش ئەوە بە چەند قۆناغێك ڕادەوەستێت هەروەك چۆن لە پێشدا ئاماژەمان پێكرد.

لێرەدا پرسیارێکی تری گرینگ دێتە پێش:

ئەو بڕە زۆرەی ئاسن کە بە زیاتر لە دوو هەزار ملیۆن ملیۆن ملیۆن تەن (٢١٤٥ ملیۆن ملیۆن ملیۆن تەن) دەخەملێنرێت لە کوێوە هاتووە؟

هەروەها خۆر ئەستێرەیەکی خۆبەخشە پلەی گەرمی سەر ڕووەکەی دەگاتە شەش هەزار پلەی سەدیو پلەی گەرمی چەقی خۆر دەگاتە نزیکەی ١٥ ملیۆن پلەی سەدی، لە کاتێکدا پلەی گەرمی پێویست بۆ بەرهەمهێنانی ئاسن بە کرداری یەککگرتنی ناوکی بە لای کەمی بە پێنج بلیۆن پلەی سەدی دەخەملێنرێت بۆیە ڕوانینی زانایان لە لێکۆڵینەوەکانیان بۆ سەرچاوەکانی ئاسن ئاراستەکراوە بۆ ژمارەیەك لە ئەستێرەکان کە پلەی گەرمیان لە پلەی گەرمیی خۆر بەرزترە بە تێکڕایەکی زۆر لەو ئەستێرە گەورانەش (ئەوەیە بارستایی یەکێکیان بە لایەنی کەم بە دە ئەوەندەی بارستایی خۆر دەخەملێنرێت)و پلەی گەرمییەکەی لە قۆناغی کۆتایی تەقینەوەکانی دەگاتە بلیۆنەها پلەی سەدی، زانایانی گەردوونناسیو فیزیای گەردوونی تێبینیان کرد لە قۆناغەکانی دوایی لە تەقینەوەی ئەستێرە گەورەکان کە بە ناوی ئاگردارە گەورەکان (المستعرات العظمی) ناسراوە، کرداری

یەككگرتنی ناوكیی هایدرۆجین بەردەوام دەبێت تا دەگاتە بەرهەمهێنانی پشتێنەیەك كە ڕێك دەكەوێت لە دەرەوە بۆ ناوەوە لە هایدرۆجین‌و دوایی هیلیۆم دوایی كاربۆن دوایی ئۆكسجین دوایی سلیكۆن‌و لە دواییدا گۆگرد لە دەوری چەقی ناوكی گەردیلەكانی ئاسن، كاتێك كرداری یەككگرتنی ناوكی دەگاتە بەرهەمهێنانی ئاسن كردارەكە بە تەواوی دەوەستێت‌و ئەستێرەكە دەتەقێتەوە پارچە گەورەكانی بڵاودەبێتەوە لە پەڕپەڕەی ئاسمان، گرینگترینیان ئەو ئاسنەیە پارچەكەی دەگاتە ئەستێرە ئاسمانییە جیاوازەكان كە پێویستیان بەم توخمە هەیە، لە كاتێكدا توخمەكانی سەرەوە لە كێشی گەردیلەییەكەی لە ناوكی گەردیلە بزێوەكانی (جووڵاوەكان) ئاسن بەدی دەهێنرێن لە پەڕپەڕەی ئاسماندا بە وەدەستكەوتنی ژمارەیەك لە پێكهاتووە بنچینەییە یەكەمیەكانی ماددە، بەوەش سەلمێنرا سەرچاوەی ئاسنی زەوی ئاسمانە، بەڵكو بۆ هەموو كۆمەڵەی خۆر بە گشتی‌و ئاسن بۆ زەوی دابەزیوە بە دابەزینێكی خواستراو هەروەك چۆن شیكەرەوەكانی (المفسرین) پێشوو خەملاندوویانە، ئەوانەی دەسەوسان بوون لە شیكردنەوەی دابەزینی ئاسن بۆ زەوی، كە دەیانگوت فرمانی (انزلنا) لێرەدا

واتای ئاسنمان دۆزیەوە یان ئاسنمان بەدیهێنا بەو سیفەتەی تواناو هێزێکی زۆری پیَ دراوەو سوودی زۆری بۆ خەڵکی هەیە.

زانستی بەدەستکەوتووی مرۆڤ هات لەوپەڕی پەرەسەندنیدا جەختی کردەوە لەسەر وردیی ئەو دەربڕینە قورئانییەی خوای گەورە کە دەفەرمووێت:

﴿..........وَأَنزَلْنَا الْحَدِيدَ ..........﴾ (سوڕەتی (الحدید): ٢٥).

بەمەش دەرکەوت دابەزینێکی ڕاستەقینەیە نەك دابەزینێکی خواستراو.

ئەم تێبینیە زانستییە وردە پاڵی بە زانایانی گەردووناسیو سروشتی گەردوونیو زەویناسان ناوە بۆ وێناکردنی (بۆچوونی) ڕاست بەوەی کاتێك زەویمان لە خۆر جیا بۆوە جگە لە تۆپەڵە خۆڵەمێشێك هیچی تر نەبووو هیچ تۆخمێکی تێدا نەبوو لە ئەلەمنیۆمو سلیکۆن قورستر بێت دوایی ئەم تۆپەڵە بەرد بارانێکی بە لێزمە کراوە لە نەیزەکی ئاسنی هەروەك نەیزەکی ئاسنیمان بۆ دادەبارێتە سەر زەوی لەم ڕۆژگارەدا بە بەردەوامی بەڵام بە بڕێکی ئێجگار زۆر. بەگوێرەی چڕییە زۆرەکەیو خێراییەکی گەردوونی زۆرو سامناکەکەی بەریەککەوتنی ئەو نەیزەکە ئاسنیە بەو زەویە

سەرەتاییەدا دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی پلەی گەرمییەكەی‌و پلەی گەرمی نەیزەكەكە تا پلەی توانەوە، ئاسنە تواوەكەو هەندێك لەو توخمە گرانانەی لەگەڵی دایە وەك نیكل‌و هەندێك خڵتەی توخمە سووكەكانی شلەی پاڵنەر پاڵدەنات بۆ چەقی زەوی لە هەموو لایەكان لەسەر شێوەی دڵۆپی گەورە لەو ئاسن‌و نیكلەی كرۆكی زەوییان دروستكردووە بە هەردوو كرۆكی ڕەقی ناوەوەو كرۆكی شلی دەرەوە، ئەمەش بووەتە هۆی جیاكردنەوەی زەوی بۆ حەوت چین كە ڕێژەی ئاسن تێیدا كەم دەكات لە ناوەوە بۆ دەرەوە بەم شێوەیە:

[١] كرۆكی ڕەقی ناوەوە: چینی حەوتەم دەنوێنێت نیوە تیرەكەی بە (١١٧٠كم) دەخەمڵێنرێت‌و چڕیەكەی لە نێوان ١٠- ١٣,٥ گرام بۆ یەك سانتیمەتر سێجایە، لە بنچینەدا لە ئاسن پێكدێت بە ڕێژەی (٩٠٪)و نیكل بە ڕێژەی (٩٪)و ژمارەیەك لە توخمە سوكەكان وەك سیلیكۆن، فوسفۆرو گۆگرد بە ڕێژەی (١٪).

[٢] كرۆكی شلی دەرەوە: (چینی شەشەم دەنوێنێت) بە ئەستووریەك بە نزیكەی (٢٣٠٠ كم) دەخەمڵێنرێت‌و بە هەمان پێكهاتەی كرۆكی ڕەق بەڵام لە شێوەی شلدایە (لە قووڵی ٢٩٠٠ كم لەسەر ڕووی زەوی بۆ قووڵی ٥٢٠٠ كم لەسەر ڕووی زەوی).




وێنەیەك جوولەی لێكدانی پلێتی بەردینی پێكهاتووی بنكی دەریاكان ڕوون دەكاتەوە.

[٣-٦] چوار كەوڵی یەك لە دوای یەك: (چینەكانی دووەم تاكو پێنجەم دەنوێنێت) ڕێژەی ئاسن كەم دەكات لە ناوەوە بۆ دەرەوە بەبەردەوامی، ئەم پشتێنەیە كە ئەستوورییەكەی دەگاتە (٢٣٠٠كم) درێژ دەبێتەوە لە بنكی چینی یەكەم تاكو چینەكانی سەرەوەی كرۆكی شلی دەرەوەی زەوی‌و پێك دێت لە بەردە پلە گەرمی بەرزەكان كە لە ژێر پەستانی بەرزدا خوساوە.

هەروەها یەكێك لە پشتێنەكانی لە بارێكی نیمچە شل دەبینرێت‌و چینی سێیەم دەنوێنێت‌و بە ( پشتێنەی بێهێزی زەوی) دەناسرێت.

[٧] بەرگی بەردینی زەوی: چینی یەكەم دەنوێنێت، ئەستوورییەكەی لە ناوەڕاستدا بە نزیكەی ١١٠كم دەخەملێنرێت (ئەستوورییەكەی لە وشكانی بە نزیكەی ١٠٠-١٥٠كم دەخەملێنرێت، لە ژێر دەریاو زەریاكان بە نزیكەی ٦٥-٧٠كم)، لە بنچینەدا لە سلیكاتی سووك پێكدێت، كە جیا دەكرێتەوە بەوەی پلەی شلبوونەوەی بە شێوەیەكی ڕێژەیی نزمەو چڕیەكەشی بە شێوەیەكی ڕێژەیی زیاد دەكات لەسەر ڕووی زەوی بۆ قووڵایی.

كرداری دابەزینی ئاسن بۆ زەوی‌و جیاكردنەوەی بۆ حەوت چین یەكێك لە ترسناكترین كردارەكان لە مێژووی زەوی دەنوێنێت، جا

ئەگەر وا نەبووایە زەوی بۆ ئاوەدانی دەستی نەدەدا، پێشەنگیی قورئانی پیرۆز دەردەبڕێت بە ئاماژە بۆ ئەو ڕاستییەی کە زانستی مرۆڤ نەگەیشتووە پێی تەنها لە ماوەی سالآنێکی کەم نەبێت، هەروەها شایەدییەکی ڕاستە بە پێغەمبەرایەتی بوون‌و دوا پەیامی پێشەوامان محەمەد (ﷺ) کە ئەم قورئانەی وەرگرت خوایە گیان سەلات‌و سەلام‌و بەرەکەتی خۆت بڕێژە بەسەر خۆی‌و ئال‌و هاوەڵانی‌و ئەوانەی دوای هیدایەتی ئەو کەوتوون بانگەشەیان بۆ ئایینەکەی کردووە تا ڕۆژی دوایی.

بە ڕاستی زۆر سەیرە پەڕاوێك ١٤٠٠ ساڵ پێش ئێستا دابەزیوە، لە بنەڕەتدا ئایەت بە ئایەت یان چەند ئایەت چەند ئایەت، هەندێك جاریش بە سوڕەتی تەواو دابەزیوەو دوایی کۆکردنەوەی ئەم پەڕاوە بە یارمەتی خوای گەورە تەواو بووو ڕێکخرا لە سوڕەتەکانی‌و ناونانی ئەو سوڕەتانەش، هەروەها ڕێکخستنی بە هەمان ڕێباز لە بلیۆنەها دانەی تردا هەیە لە پەڕاوە زۆرەکان لە پەرتووکخانەکانی دونیاداو لای کەسایەتییەکان‌و هەر هۆکارێکی تری پاراستن‌و لە دڵی بلیۆنەها لەو تاکانەی بە گورجوگۆڵی لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) وەریانگرتووە ئەمەش بە یارمەتی خوا،

ئـەم پـەڕاوە سـوڕەتێكی تێدایـە بـە نـاوی سـوڕەتی (الحديـد: واتـا ئاسـن) تاكـە توخمـە سـوڕەتێكی قورئـانی پـیرۆزی بـە نـاوەوە دابەزیوەو ئایەتێك لە ئایەتـەكانی ئـەم سـوڕەتە بـاس لـە دابـەزینی ئاسن دەكات لە ئاسمانەوە بـۆ زەوی، ئەمـەش ڕاسـتییەكە زانسـتی مـرۆڤ پێـی نەگەیـشتووە مەگـەر پـاش چـەند سـاڵانێكی دوایـی لـە سـەدەی بیـستەمدا نـەبێت، دوایـی ئـەوەش دۆزرایـەوە ژمـارەی سوڕەتی (الحديد) یەكسانە بە كێشی گەردیلەیی تـوخمی ئاسـن لـە زۆربەی زڕتوخمە بڵاوەكـانی ئاسـن، هـەروەها ژمـارەی ئایەتـەكانی ئـەم سـوڕەتە یەكـسانە بـە ژمـارەی گەردیلـەیی ئاسـن، ئـەم ڕێككەوتنەش هەرگیز ناكرێت كارێكی ڕێكەوت بێت.

باوترین زڕتوخمی ئاسنی تیشكدار ناودەبرێت بە زڕتوخمی ٥٦ و هێماكەی ($_{٢٦}^{٥٦}Fe$) كۆی نزیكەی ٩٢٪ (٩١,٦٦٪)ی زڕتوخمەكانی ئاسنی ناسراو پێكدەهێنێتو ناوەندەكێشی گەردیلەكەی بە نزیكەی ٥٦ (٥٥,٨٤٧)و ژمـارەی گەردیلەییەكـەی دەگاتـە (٢٦)و سـوڕەتی (الحديد) ژمارەكەی لە قورئانی پیرۆز (٥٧)ەمـین سـوڕەتە ژمـارەی ئایەتەكانی (٢٥) ئایەتە.













وێنەیەك چۆنیەتی پێکهاتنی چیایەکانی هیمالایا نیشان دەدات لەگەڵ کاتدا، ئەوەش بە کاری لێکدانی دوو کیشوەر.

بەلاَم ئەگەر وتەی ڕاستی خوای گەورە بێتەوە یادمان بەرامبەر بە دواینی پێغەمبەران (محەمەد) (ﷺ) کە دەفەرموویێت:

﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ سَبْعًا مِّنَ ٱلْمَثَانِى وَٱلْقُرْءَانَ ٱلْعَظِيمَ ﴿٨٧﴾﴾ (سورەتی (الحجر): ٨٧).

واتا: سوێند بێت ئەی پێغەمبەر ئێمە حەوت ئایەتمان پێداویت (کە سورەتی فاتیحەیە) هەروەها قورئانی گەورەو مەزنیشمان پێ بەخشیوویت.

زانیمان قورئانی پیرۆز بە دەقی خۆی سورەتی فاتیحە جیا دەکاتەوە وەکو پێشەکییەك بۆ سورەتەکانی تری قورئانو کاتێك ژمارە دانانی سورەتەکانی قورئان بە شێوەیەکی دەستبەسەر نەبوو، کەواتە بە مانای ئەم ئایەتە پیرۆزە یەکەم سورەتی قورئانی پیرۆز بریتییە لە سورەتی (البقرة) بەوەش ژمارەی سورەتی (الحدید) دەبێتە (٥٦)ەمین سورەتو ئەوەش بریتییە لە کێشی گەردیلەی ئاسن لە زۆربەی زڕتوخمی ئاسنی باو، هەروەها ژمارەی ئایەتەکانی سورەتی فاتیحە شەش ئایەتە دوای بەسمەلەو قورئانی پیرۆز بە (سبعا من المثاني) وەسفی دەکات، ئەمەش واتای بەسمەلە یەکەم ئایەتی سورەتی فاتیحەیەو ئایەتیشە لە هەموو

ســوڕەتێك لــە ســوڕەتەكانی قورئــانی پــیرۆز کــە لــە ســەرەتایدا باسکراوەو لە سەرەتای هەموو سوڕەتێکی قورئاندا هاتووە جگە لە سوڕەتی (التوبة) نەبێت، جا ئەگەر وامان دانا بەسمەلە بریتییـە لـە یەکەم ئایەتی سوڕەتی (الحدید) ژمارەی ئەو ئایەتەی باسـی ئاسـن دەکـات لــە ســوڕەتەکە دەبێتــە (٢٦) کــە بریتییــە لــە ژمــارەی گەردیلەیی توخمی ئاسن.

ئەوەی زانراوە زانـینی هەریـەك لـە كێشی گەردیلـەیی‌و ژمـارەی گەردیلەیی توخمەکان لە کارە تازەکـانی ئـەم سـەردەمەی زانـستی مرۆڤەو هیچ کەسێك لە کاتی دابـەزینی قورئـانی پـیرۆزداو لـە پـاش چەند سەدەیەکی دوورودرێژ لە دوای دابەزینی قورئان ئاشنایی لـەم کارەدا نەبوو، ڕێککەوتنی ژمـارەی سـوڕەتی (الحدیـد) لـە قورئـانی پیرۆزدا لەگەڵ کێشی گەردیلەیی لە زۆربەی زڕتوخمە باوەکانی ئـەم توخمـەو ڕێککـەوتنی ژمـارەی ئـەو ئایەتـەی باسـی ئاسـن دەکـات‌و جەختدەکاتەوە لەسەر ڕاستێتی دابەزینی ئاسن لـە ئاسمـان لەگـەڵ ژمـارەی گەردیلـەیی ئاسـن ئـەوە دەبڕێنێتـەوە کـە قورئـانی پـیرۆز ناکرێت دەسـتکردی مـرۆڤ بێـت‌و بڕیـار دەدات بـە پێغەمبەرایـەتی‌و پەیامی دواین نێردراو سەلات‌و سەلام‌و بەرەکەتی خوا لەسـەر ئـەوو هەموو هاوەڵانی‌و ئەوانەی شوێنی ڕێبازەکـەی‌و بانگەوازەکـەی ئـەو

دەكەون تا ڕۆژی دوایی‌و سوپاس بۆ خوای پەروەردگاری هەردوو جیهان.

بەلاّم لەسەر توانای بەهێزی ئاسن، بە زانست ئەوە چەسپاوە ناوكی گەردیلەی ئاسن بەهێزترین ناوكی توخمەكانە كە بەیەكەوە بەستراوە، بە واتای یەكگرتنی بەهێزی پێكهاتووە بنچینەییەكانی ماددەیە لە ناوكی گەردیلەیەك لە گەردیلەی توخمەكانی تر، لەوانەیە ئەوە لە هۆیەكانی ئەو سیفەتە سروشتی‌و كیمیاویە جیاكراوانەی ئاسن بێت تایبەتمەندی (الباس الشدید) توانای بەهێزی پێداوە، بەلاّم لە سودەكانی بۆ خەڵكی ئاسن ڕەگوڕیشەی پیشەسازی‌و شارستانی‌و جەنگیەكان دەنوێنێت هەروەك یەكەی بنچینەییە لە بنیاتنانی گەردی هیمۆگلۆبین (یان خڕۆكە سورەكانی خوێنی مرۆڤو لە خوێنی زۆربەی ئاژەلاّندا)، ئەگەر ئاسن لە كرۆكی زەوی نەبوایە ئەوە بواری موگناتیسیی نەدەبوو، ئەگەر بواری موگناتیسی نەبوایە زەوی نەیدەتوانی بەرگی ئاوو بەرگی هەوایی لە خۆی بگرێت، شێوە جیاكانی ژیانیش لەسەر ڕووەكەی نەدەبوو.

## سێیەم:ـ جولەی پلێتەکانی بەرگی (داپۆشەری) بەردینی زەوی:

سەرەڕای ئەوەی چەمکی خشانی (خزینی) کیشوەرەکان کە زانای ئەڵمانی (Alfered.Wagnar ) لە ساڵی ١٩١٥ز پێشنیاری کرد مایەوە تا لە لایەن زۆربەی زەویناسان ڕەتکرایەوە تاوەکو گەلاڵەکردنی (چەمکی جوڵەی پلێتەکانی بەرگی بەردینی زەوی (Plate tectonic ) تەواوبوو لە ساڵی ١٩٦٥ز لەسەر دەستی زانای کەنەدی (توزو ولسن) (Tuzo Wilson) دوای هەوڵدانێکی زۆر لە لایەن هەزاران زانا بۆ ماوەی زیاتر لە نیو سەدە، ئەم چەمکە دەوەستێتە سەر بنچینەی لەتلەتبوونی بەرگی بەردینی زەوی بە تۆڕێکی گەورە لە درزی پێکهاتوو لە زنجیرەیەك لە ڕۆچوونی زەوی کە دەوری زەوی داوە بە دەوردانێکی تەواو بۆ مەودایەك بە دەیان هەزار کیلۆمەتر دەخەملێنرێتو بە قووڵی (٦٥– ٧٠) کیلۆمەتر لە بنکی ڕوبارو زەریاکانداو لە نێوان (١٠٠–١٥٠) کیلۆمەتر لە بارستایی کیشوەرەکاندا.

ئەم تۆڕە درزەی ئەمەشی لێ دروست دەبێت لە ڕۆچونی زەوی هەڵدەستێت بە دابەشکردنی بەرگی بەردینی زەوی بۆ ژمارەیەك

پلـێتی زەوی جیـاواز لـە ڕووبـەرو شـێوەو بارسـتاییو ئـەم پلێتانـە جیاكراونەتەوە لە یەكتری بەم تۆڕە درزانە كە دەمەوانەی ئاسایشی زەوی دەنوێنێت كە چەندایەتییەكی زۆر گەورە لـە گـەرمی بەرهـەم هـاتوو لـە كـرداری شـیبوونەوەی توخمـە تیـشكدەرەكانی تێـدا دەردەپـەڕێت: لـە پاڵـدانی بـەردە تواوەكـان لـە پـشتێنەی لاوازی زەوی بۆ پڕكردنەوەی ئەو ڕۆچـوونەی زەوی دەبێتـە هـۆی جوڵـەی ئـەو پلێتـە پێكهـاتووەی بـەرگی بـەردینی زەویو دەجوڵێـت بـە بەردەوامی یـان لـە یـەك دوور دەكەوێتـەوە (لـە دیاریدەیـەك بنكـی ڕووبارەكانو هەموو زەریاكان دەگرێت، لەبەر ئەوە ناو دەبرێـت بـە دیاریدەی فراوانبوونی بنكی ڕووبارو زەریاكـان، ئەگـەر لـە وشـكانی ڕووی بدایـە یـان بەریەككـەوتن بوایـە لەگـەڵ یـەكتر بـە شـێوەیەك یەكێك لە پلێتـە بەریەككـەوتووەكان دابەزێتـە ژێـر ئـەوەی تـر بـۆ ئەوەی شـل ببێتـەوە شـلبوونەوەو توانەوەیـەكی بەشـەكی یـان بـە گشتیو دەبێتە هۆی چالاكی گڕكانی چاوەڕوانكراو، هەروەك پلـێتی بـەردینی ژێركـەوتوو لـە پـشتێنەی بێهێـزی زەوی كاردەكاتـە سـەر خشانی بڕێك لەو تواوەیەو بەمەش كاری بەیەكداچوونە ئاگرینـەكان چالاك دەبێت).




وێنەیەك جوولەی لێكدانی پلێتی بەردینی پێكهاتووی بنكی دەریاكان ڕوون دەكاتەوە.

پلـێتی زەوی جیـاواز لـە ڕووبـەرو شـێوەو بارسـتایی‌و ئـەم پلێتانـە جیاكراونەتەوە لە یەكتری بەم تۆڕە درزانە كە دەمەوانەی ئاسایشی زەوی دەنوێنێت كە چەندایەتییەكی زۆر گەورە لـە گـەرمی بەرهـەم هـاتوو لـە كـرداری شـیبوونەوەی توخمـە تیـشكدەرەكانی تێـدا دەردەپـەڕێت: لـە پاڵـدانی بـەردە تواوەكـان لـە پـشتێنەی لاوازی زەوی بۆ پڕكردنەوەی ئەو ڕۆچوونەی زەوی دەبێتـە هـۆی جوڵـەی ئـەو پلێتـە پێكهـاتووەی بـەرگی بـەردینی زەوی‌و دەجوڵێـت بـە بەردەوامی یـان لـە یـەك دوور دەكەوێتـەوە (لـە دیاریدەیـەك بنكـی ڕووبارەكان‌و هەموو زەریاكان دەگرێت، لەبەر ئەوە ناو دەبرێـت بـە دیاریدەی فراوانبوونی بنكی ڕووبارو زەریاكـان، ئەگـەر لـە وشـكانی ڕووی بدایـە یـان بەریەككـەوتن بوایـە لەگـەڵ یـەكتر بـە شـێوەیەك یەكێك لە پلێتـە بەریەككـەوتووەكان دابـەزێتـە ژێـر ئـەوەی تـر بـۆ ئەوەی شـل ببێتـەوە شـلبوونەوەو توانەوەیـەكی بەشـەكی یـان بـە گشتی‌و دەبێتە هۆی چالاكی گڕكانی چاوەڕوانكراو، هەروەك پلـێتی بـەردینی ژێركـەوتوو لـە پـشتێنەی بێهێـزی زەوی كاردەكاتـە سـەر خشانی بڕێك لەو تواوەیەو بەمەش كاری بەیەكداچوونە ئاگرینـەكان چالاك دەبێت).



وێنەیەك جوولەی لێكدانی پلێتی بەردینی پێكهاتووی بنكی دەریاكان ڕوون دەكاتەوە.

یەكێك لە پلێتەكانی بەرگی بەردینی زەوی دەخزێت لە لای سنورەكەی لەگەڵ ئەوانی ترو لەگەڵ پلێتە دراوسێكانی بەهۆی ژمارەیەك لە درزەكان كە دەناسرێن بە ناوی (درزە ئاڕاستەییەكان یان درزە دەستوریەكان) یان (درزەكانی گۆڕان) ( Strike-slip or transform fault)و ئەگەر خودای گەورە ئەم تۆڕە گەورەیەی لە درز بۆ زەوی دروست نەكردایە زەوی دەتەقیەوە لەسەر شێوەی بۆمبێكی ناوەكی گەورە لە سەرەتای دروستبوونو ڕەقبوونی توێكڵی زەوییو هەموو زەویناسانی ئەمڕۆ بڕیار لەسەر ئەوە دەدەن لە سیفەتە بنچینەكانی گۆی زەوی ئەوەیە كە بەرگە بەردینەكەی لەتلەتە بە تۆڕێكی گەورە لەم درزەی دەوری گۆی زەوی داوە بە دەوردانێكی تەواو لە گەیاندنێكی تەواو هەروەك بڵێی یەك درزی بەردەوامە پێشتر قورئانی پیرۆز ئاماژەی بۆ ئەم ڕاستییە داوە كە خودای گەورەو باڵادەست فەرموویەتی:

﴿وَٱلۡأَرۡضِ ذَاتِ ٱلصَّدۡعِ ١٢﴾ (سورەتی (الطارق): ١٢).

واتا: هەروەها سوێند بە زەوی كە درزی تێ دەبێت.

لەم ئایەتە پیرۆزەدا خودای گەورە ئاماژە بەوە دەكات لەسەر شێوەی سوێند بۆ ئاگاداركردنەوەمانو گرنگی دانمان بەوەی سوێندی پێ دابەزیوە چونكە خوای بەرزو پیرۆز بێنیازە لە سوێند خواردن بە بەندەكانی.

لە ناو ئەم تۆڕە درزە گەورەیەی زەوی بەردە تواوەكانو شلەكانی پاڵدەنرێن بۆ پڕكردنەوەی ئەو ڕۆچونانەی زەوی نێوان درزەكان بەهۆی ملیۆنەها تەن لە (صهیر) مادە شلو گەرمە پاڵپێوەنراوانە بۆ بنكی زەریاكان كە پلەی گەرمیی دەگاتە هەزار (١٠٠٠) پلەی سەدی پاڵدەنێت بەو هێزەی بە هەردوو لاكانی بنكی زەریا واتا لای ڕاستو لای چەپ بۆ ڕوودانی (دیاریدەی فراوانبوونی بنكی ڕووبارو زەریاكان)و ئەم فراوانبوونەی دروست دەبێت پڕدەبێتەوە بە ماددە تواوە پاڵپێوەنراوەكان لە (پشتێنەی بێهێزی زەوی) دەبێتە هۆی داگیرسانی بنكی هەموو زەریاكانی زەوی، ژمارەیەك لەم دەریایانەی بنكیان درزدرزە وەك دەریای سوور، ئەمەش ڕاستێتی پێشەنگی قورئانی پیرۆزە بەسەر هەموو زانیاریە مرۆڤایەتیەكان بە زیاتر سێزدە سەدەو نیو هەر وەك ئاماژەی بۆ كردووە كە خودای گەورە فەرموویەتی:

﴿وَٱلۡبَحۡرِ ٱلۡمَسۡجُورِ ۝٦﴾ (سورەتی (الطور): ٦).

فەرمانی (سجر) واتا داگیرساندن لە زمانی عەرەبیدا واتا گڕگرتن لەسەر شتێك تا داخ دەبێت، (المسجور) ئەو شتەیە گڕی تێبەردەبێت تا پلەی گەرم بوون.

لێرەدا ئایەتەكە بە شێوەی سوێند هاتووە بۆ مەبەستی ئاگادار كردنەوە بۆ گرینگیی ئەم دیاریدەیەی خوا سوێندی پێ خواردووە، خوداش پێویستی بەوە نییە سوێند بە بەندەكانی بخوات.

پلێتەكانی بەرگی بەردینی زەوی لە جوڵەیەكی بەردەوامدان، لە یەكتر دووردەكەونەوە لە بنكی زەریاو دەریاكان، ئەم دووركەوتنەوەیە دەبێتە هۆی پاڵنانی ملیۆنەها تەن لە بەردی تواوەو شلەوەبوو بۆ پڕكردنەوەی مەودای دروستبوو لەم دووركەوتنەوەیەداو دەبێتە هۆی زیاتر دووركەوتنەوەیان، هێزە هەڵگرە جوڵاوەكان یارمەتی دەدات لە پشتێنەی زەوی لە ژێر ئەم پلێتە بەرزبووانە لە ژێرەوە بۆ سەرەوە لە پلەكانی گەرمیی زۆرو لە ڕادەبەدەر، دوایی دەكەوێتە خوارەوە لەكاتی ساردبوونەوەی ڕێژەیی.

وێنەیەك چۆنیەتی پێکهاتنی چیایەکانی هیمالایا نیشان دەدات لەگەڵ

کاتدا، ئەوەش بە کاری لێکدانی دوو کیشوەر.

خولانــــەوەی زەوی بـــە دەوری تەوەرەكەیـــدا بـــە هۆكـــارە دیاریكراوەكـان دادەنرێـت لەسـەر خێراكردنـی جوڵـەی پلێتـەكانی بەرگی بەردینی زەوی لە كاتێكدا ئەم بارستاییە بەردینـە گەورەیـە دەخزێت لەسەر پشتێنەی بێهێزی زەوی لەگەڵ ئەم خولانەوەیـەدا، لە توندو تیژی ئەم جووڵەیەی كـەم نابێتـەوەو هـێمن نابێتـەوە یـان بیوەستێنێت مەگەر تـا دەبێتـە زنجـیرە چیاكان جا كاتێك بنكـی زەریاكان لە ناوەندییەوە فراوان دەبێت پاڵدەنێت بەم دوو نیوە لێك دووركەوتووەوەی ئەملاو ئەولای بۆ ئەوەی هەر یـەكێكیان بكەوێتـە ژێر ئـەو كیشوەرەی بەرامبـەری لـە هـەموو ئاڕاسـتەیەك جـا چـاڵی قـووڵ دروسـت دەبێـت لەسـەر هێڵـی جیاكـەرەوەی نێـوان پلـێتی بـــەردینی پێكهـــاتووی بنكـــی زەریـــاو پێكهـــاتووی بارســـتەی كیشوەرەكەو لەو خەندەقـە دەریایـە قووڵـەدا ئەندازەیـەكی زۆر لـە نیشتەنیەكان كۆدەبێتەوەو بـە بـەردەوامی بنكـی دەریـا دەجوڵێـت واتا كەوتنو چوونە ژێر كیـشوەرو نیـشتەنییە دەریاییـەكان پلەپلـە لادەدرێت لەسەر پلێتی ژێركەوتووو دەخرێتە سەر لایـەنی كیـشوەر بـۆ پێكهێنـانی زنجـیرە چـیای نـوێ، یـان دەخرێتـە سـەر زنجـیرە چیاكان كە پێشتر لەسەر لایەكی كیشوەرەكە دروستبووە.

بە بەردەوامیی ڕۆچوونی بنكی دەریا بۆ ژێر كیشوەرەكە دەگاتە پشتێنەی بێهێزی زەویو دەست دەكات بە شـلبوونەوەو توانـەوەی پلەپلـە كـە یارمـەتی زیـادكردنی چـالاكی گڕكـانی دەدات، هـەروەك

دەبێتە هۆی لادانی چەند بەشێك لە پشتێنەی بێهێزی زەوی کە کرداری بە یەکداچوونە ئاگرینەکان چالاك دەبێتو لەم تێکەڵەیە لە بەردە نیشتەنیەکان کە بەهێزن بۆ پێچکردنەوەو شکان، بەردە ئاگرینە بەیەکداچووەکانو بەردە گڕکانیەکانو ئەوەی دروست دەبێت لەم تێکەڵەیە لە بەردە گۆڕاوەکان زنجیرە چیاکان دروست دەبێت، لە زەویدا ڕۆدەچنە خوارەوە بە درێژایی لە نێوان (١٠–١٥) ئەوەندەی بەرزاییەکەی لەسەر ڕووی زەوی کە کاردەکات لەسەر جێگیرکردنی بارستایی کیشوەرەکان لە بنکی زەریاکان.

لە هەندێ باردا یەکێك لە کیشوەرەکان دەجولێت بۆ پاڵنانی بنکی ئەو زەریایەی لە پێشەوەیەتیو لە کیشوەری بەرامبەری لێك جیا دەکاتەوە، هەتا بکەوێتە ژێر ئەو کیشوەرە تاوەکو بە تەواوی بەکاردەبرێتو ڕۆدەچێت هەردوو کیشوەر بەریەك دەکەون بەشێوەیەکی زۆر توندو یەکێکیان سەر ئەوی تر دەکەوێت، لەسەر پلێتە سەرکەوتووەکە لەسەر هێڵی بەریەککەوتنی هەردوو پلێتەکە بەرزترین زنجیرە چیاکان دروست دەبێت، بە شێوەیەکی ئاسایی پێکهاتووە لە بەردی بەهێز بۆ پێچکردنەوە (FOLD)و شکان لە جۆرە جیاوازەکانی نیشتەنیو ئاگرینو گۆڕاوەکان، لێرەدا جوڵەی پلێتەکانی بەرگی بەردینی زەوی بۆ ماوەیەکی درێژ ڕادەوەستێت.

لەبەر ئەوەیە قورئانی پیرۆز وەسفی چیاکان دەکات لە (٣٩) شوێن (لەوانە ٦ جار بە تاكو ٣٣ جار بەشێوەی کۆیە) بەوەی

ڕاگرەكانن بۆ زەوی‌و ئاماژەیەك هاتووە بۆ چیاكان بە دەربڕینی (رواسي)و لە دە ئایەتی تر، لە یەكێك لە ئایەتەكانی چیاكاندا وەسفی قورئانی پیرۆزی بۆ هاتووە بەوەی وەك مێخە (اوتاد) ئەوەش لە وتەی ڕاستی خودای مەزنە كە دەفەرمووێت:

﴿أَلَمْ نَجْعَلِ الْأَرْضَ مِهَادًا ﴿٦﴾ وَالْجِبَالَ أَوْتَادًا ﴿٧﴾﴾ (سوورەتی (النبـاء): ٦ـ٧).

واتا: ئایا زەویمان وەك لانكە بۆ فەراهەم نەهێناوە؟* (ئایا) كێوەكانمان وەك مێخ بۆ دانەكوتاوە؟ (تا زەوی بپارێزرێت لە فشاری گڕكان‌و ماددە تواوەكانی ناو ناخی، هەروەها تا لەنگەری ڕابگرێت‌و چەندەها سوودی ترتان پێ بگەیەنێت).

هەروەك ئەو مێخە زۆرینەی لە زەویدا شاراوەتەوە، كەمێكی دیارە لەسەر ڕووی زەوی‌و كارەكەشی چەسپاندنە، زانستەكانی زەوی دوایی سەلماندیان كە چیایەكان ئاوەهان، هەموو بەرزبوونەوەیەكی لەسەر ڕووی زەوی درێژبوونەوەیەكی لە ناوەوەی هەیە هێندەی (١٠-١٥) ئەوەندەی بەرزییەكەی دەبێت لەسەر ئەو ڕووەیەوە، هەرچەندە بەرزاییەكەی لەسەر ئاستی ڕووی دەریاوە گەورە بوو، بەشە ڕۆچووەكەی لەناو بەرگی بەردینی زەوی درێژبوونەوەیەكەی چەندجارەی دەبێت بە قوڵییەكەی.

تاكو ئەو بەرگی بەردینە بە تەواوی دەبڕێت، لەسەر پشتێنەی بێهێزی زەوی دەگیرسێتەوە هەروەك چۆن چیایە سەهۆڵیەكان

لەسەر ئاوی زەریاکان دەگیرسێتەوە و یاسای تەنی سەرئاوکەوتن مامەڵەی لەگەڵدا دەکات، کاتێك هۆکارەکانی داڕنین‌و داخوران لە لوتکەی چیاکانیان برد، ئەو چیایانە بەرزدەبنەوە بۆ سەرەوە تا بە تەواوی لە پشتێنەی بێهێزی زەوی دەردەچێت، لەو کاتەدا چیاکان لە جوڵە دەوەستن تاکو خۆڵەکەی تەواو دەبێت، جا لە ڕەگە قوڵەکانیدا سامانەکانی زەوی دەردەکەوێت کە ناکرێت دروست ببێت تەنها لەژێر ئەم بارە نائاساییە نەبێت لەم پەستان‌و گەرمییەی کە باوە لە ڕەگە قوڵەکانی چیاکاندا.

لەبەر ئەوەیە قورئانی پیرۆز بۆ چیاکان بەوەی کە (مێخەکە) (اوتاد) ئەوە وەسفێکی دەرئاسایە، چونکە بە یەك وشە شێوەی دەرەوەی چیاو درێژبوونەوە قوڵە ناوەکییەکانی‌و کارەکەی دەربڕیوە، ئەم وشەیە (اوتاد) پێشەنگیی قورئانی پیرۆزی چەسپاند بۆ هەموو زانیاریە بەدەستکەوتووەکان کە تا ئەم ڕۆژگارەی ئێستامان وەسفی چیاکان دەکرێت لە زۆربەی فەرهەنگە زانستی‌و زمانەوانیە بەربڵاوەکان بەوەی بریتین لە هەڵئاساوەکانی سەر ڕووی زەوی‌و جیاوازن لەڕووی دیاریکردنی مەودای بەرزییان، بەمەش جیایان دەکاتەوە لە هەموو گردو تەپۆڵکەیەك.

ئایەتەکانی قورئان وەسفی چیاکان دەکەن بەوەی وەك مێخەك‌و ڕاگیرکارن بۆ زەوی هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿وَأَلْقَىٰ فِي الْأَرْضِ رَوَاسِيَ أَن تَمِيدَ بِكُمْ ....﴾ (سورەتی (النحل): ١٥).

وتەی خوای گەورە كە دەفەرمووێت:

﴿وَالْجِبَالَ أَرْسَاهَا ﴿٣٢﴾ مَتَاعًا لَّكُمْ وَلِأَنْعَامِكُمْ ﴿٣٣﴾﴾ (سورەتی (النازعات): ٣٢ـ٣٣).

واتا: كێوەكانیشی بە تۆكمەیی دامەزراندووە* (هەموو ئەمانەمان دروست كردووە) تا ببێتە هۆی ئەوەی خۆتانو ماڵاتەكانیشتان سوودی لێ وەربگرن.

ئەم ڕاستیانە تا ساڵانی دوایی لە سەدەی بیستەم نەزانرا، دوای گەلاڵەكردنی چەمكی (جوڵەی پلێتەكانی بەرگی بەردینی زەوی)، ئەمەش جوڵەیەكە زەوی دەهەژێنێت هەژانێك لە سەرەتای بەدیهێنانیەوە، ئەم گرو توندیەی هێمن نابێتەوە تەنها بە پێكهاتنی زنجیرە چیاكان نەبێت، هەر بۆیە پەروەردگارمان چەسپاندنی زەویمان بەهۆی چیاكانەوە لە دە ئایەتی قورئانی پیرۆز بۆ كورتدەكاتەوە، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: ((عندما خلق الله الارض جعلت تميد فارساها بالجبال)).

واتا: كاتێك خوای گەورە زەوی دروستكرد، بۆ ئەوەی زەوی هاوسەنگی تێك نەچێت خوای گەورە بە چیاكان ڕاگیریكرد.

# کۆتایی

لـەم نمایـشکردنە خێرایـەدا پێـشەنگیی قورئـانی پـیرۆز ڕوون دەبێتـەوە بـە ئامـاژەکردن بـۆ ژمارەیـەك لـە ڕاسـتیەکانی زەوی‌و ئاسمان (گەردوون) کە زانـستی مـرۆڤ دوای چـەند سـاڵانێکی دوایـی نەبێت لە سەدەی بیستەم پێی نەگەیشتووە لەوانە وەك:—

١ــ تەقینـەوە گەورەکـە یـان (فتـق الرتـق، لێـك جیاکردنـەوەی زەوی‌و ئاسمانەکان).

٢ـــ دوکـەڵی ئاسمـانی یەکـەم‌و بـەدیهێنانی زەوی‌و هـەموو ئەسـتێرەکان (هەسـارەکان)و ماددەکـانی ئاسمـان لـەم دوکەڵـە یەکەمیە.

٣ــ ڕاستێتی دابەزینی ئاسن بۆ زەوی لە ئاسمانەوە .

٤ــ ڕاستێتی درزبوونی زەوی‌و داگیرسان‌و پڕبوونی بنکی هـەموو زەریاکان‌و ژمارەیەك لە دەریاکان.

٥ــ ڕاستێتی جوڵەی پلێتی بەرگی بەردینی زەوی.

٦ــ وەسفی چیاکان بەوەی مێخەکەو لەنگەرگرتنە بۆ زەوی.

٧ــ فراوان بوونی گەردوون‌و کشانی.

٨ــ پێچانەوەی ئاسمانەکان‌و زەوی لە کۆتایی ژیانی دونیا.

٩ـ ڕاستێتی چوونەوەیەكی گەردوونو گەڕانەوەی بۆ شێوەی یەكەمی بۆ تەقینەوە سەر لە نوێو دەگۆڕێت بۆ دوكەلێك، زەویەكی بێجگە لەم زەویەی لێ بەدی دەهێنرێتو ئاسمان گەلێكیش بێجگە لەم ئاسمانانەی ئێستا.

ئەمانە چەند ڕاستیەكی زانستین كە قورئان پێش هەموو زانستەكان ئاماژەی پێكردووە بە شێوەیەكی زانستی وردو فراوانو گشتگیری جیادەكرێتەوە، ئەوەش پێش زیاتر لە سێزدە سەدەو نیوو هاتنی لە قورئانی پیرۆزی دابەزێنراو بۆ سەر دوایین پێغەمبەرو نێردراوی (ﷺ) بەر لە چواردە سەدە لە كاتێكدا شایەدی بۆ ئەم پەڕاوە دواینە دەدات بەوەی وتەی خودای بەدیهێنەرە لە دڵسۆزییە پەروەردگاریەكەیو درەوشانەوە نووراویەكانی كە گومانی تێدا نیە بچوكترین گومان لە گومانەكانی (تحريف)و لە جێ دانانو گۆڕین كە بەسەر هەموو ئەو پەڕاوە ئاسمانیانەدا هاتووە كە بەر لە قورئانی پیرۆز دابەزیون لە ڕووی مێژووەوە، لێرەدا ئەم ئایەتە گەردوونیانە بانگەوازێك بوو بۆ خەڵكی ئەم سەردەمەمان (سەردەمی زانستو وردەكاری) كە خەڵكی پێوە سەرقاڵبوونە بەشێوەیەكی گەورە بۆ ئەوەی قورئانی پیرۆز بخوێننەوە، حوكمی پێبكەن بەبێ

لایەنگیریو دەمارگیری کوێرانە ئەگەر ئەمە وتەی خودای بەدیهێنەر بێت، یان وتەی بێجگە لە خودای گەورە بێت.

﴿وَٱللَّهُ غَالِبٌ عَلَىٰٓ أَمْرِهِۦ وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾

(سورەتی یوسف: ٢١).

وصلى الله وسلم وبارك على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه ومن تبع هداه ودعا بدعوته الى يوم الدين، والحمد لله رب العالمين.

# ناوەڕۆك

بابەت — لاپەڕە